# بنیادنانی کەسایەتی

## چۆن دەبێت و بەرز ڕادەگیرێت؟

نوسینی : فاتیح مەلا ڕەسول شارستێنی







2017








بنیادنانی کەسایەتی چۆن دەبێت‌و بەرز ڕادەگیرێت؟!

ناوی نووسەر: م. فاتیح مەلا رەسول شارستێنی

نەخشاندنی نوسین: مەریوان ئەحمەد

نەخشاندنی بەرگ: حەکیم بەکر

تایپ: ئیحسان ئەحمەد

نۆبەی چاپ: یەکەم، ٢٠١٧

تیراژ: ١٠٠٠دانە

لە بەڕیوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان، ژمارە سپاردنی (١١٧١)ی ساڵی (٢٠١٧)ی پێدراوە..

پڕۆژەی گەشە بۆچاپ‌و بڵاو کردنەوەی کتێب

هەوڵێک بۆ گەشەپێدان‌و تێگەیشتن

بۆ پەیوەندی: ٠٧٥٠١٢١٤٧٧٣-٠٧٥٠١٣٦٥٢١٥

## پێشکەشە بە:

١- پێغەمبەری سەروەرمﷺ ئەو کەسەی کەخوا کردی بە ڕەحمەت، بۆ هەموو عالەم و لابەری هەموو زەحمەتێك.

٢- باوك و دایکی خۆشەویستم.

٣- هەموو مامۆستاکانم.

٤- هاوسەر و هاوژینم (سێوە خان) کەهەمیشە هاوکارم بوە.

٥- جگەر گۆشەکانم: (محمد و ئیبراهیم و ئاسودە و ئەڤین) خوای گەورە قبوڵیان بفەرموێت بە خزمەتکاری ڕێبازەکەی پێغەمبەری خواﷺ، لە کێشە و گرفت لەگەڵ ڕۆڵەی مسوڵمانان بیان پارێزێت.. ئامین..

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿وَلَا تَسْتَوِى ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ ۚ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِى بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ وَلِىٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾﴾

## پێشەکی

سوپاس‌و ستایش بۆ خوای پەروەردگار، درودو صلاوات بۆسەر گیانی پێشەوای مرۆڤایەتی‌و خاوەنی بەرزترین کەسایەتی لەمێژوودا (محمد) ﷺ..

خوێنەری سەنگین: ئەوەی کەوا لەژیاندا مرۆڤ دەکات بەکەسێکی سەرکەوتوو خۆشەویست لەلای خۆی‌و خەڵکی بریتیە لە کەسایەتیەکی دامەزراو ڕێزدار. ئەوەش کەلەدوای مردن بۆ مرۆڤ دەمێنێتەوەو یادی خێری دەکرێت هەر بەکەسایەتیەکەیەتی، ئەوانەی خاوەن کەسایەتی بەرزن، ناودارانی مێژوون.. بێگومان خراپترین شتیش کەمایەی بەدبەختی‌و شەرمەزاریە بۆ مرۆڤ خۆی‌و بنەماڵەو نەوەکانی بریتیەلە کەسایەتیەکی دۆڕاوو فرۆشراو و سوک‌و کەم نرخ..

هەر بۆیە لەدرێژایی مێژوودا تانەدان لەکەسایەتی کەسێك‌و شێواندنی کەسایەتی ڕاستەقینەی مرۆڤێك وەکو لەناوبردنی جەستەی‌و کوشتن، حسابی بۆکراوە. بگرە شێواندن‌و زڕاندنی ناوبانگ‌و کەسایەتی مرۆڤێکی چاك زۆرگرانترە لەکوشتنی‌و لەناوبردنی، چونکە زۆرجار مرۆڤ بەکوشتن‌و لەناوبردن پلەی شەهیدی وەردەگرێ‌و ناحەزەکەی پێی غەمبار دەبێت. بەڵام مرۆڤ کەکەسایەتی شێواو بەسومعەی خراپەوە ناسرا، هەموو ڕۆژێکی مردنێکە هەربۆیە تاوانی لەکەدارکردنی کەسایەتی کەسێکی پاك‌و بێ تاوان لەگوناهە هەرە گەورەکانە.

هەروەها ئەگەر قورئانی پیرۆز بخوێنینەوە دەبینین لەباسی پێغەمبەراندا، ئەوە بەئاشکرا باسکراوە کەنەیارو ناحەزانی پێغەمبەران، هەروەك لەهەوڵی لەناوبردنی جەستەیی پێغەمبەران بوون‌و سەریان سەریان بڕیون‌و بەمشار لەتیان کردون، زۆر لەوە زیاتر خەریکی شکاندن‌و زڕاندنی ناوبانگ‌و کەسایەتیان بوون.

ئەوەتا موسای پاك‌و خاوەن دەستی سپی لەلایەن فیرعەونی دیکتاتۆرو خوێن ڕێژەوە بەناپاك‌و خائین‌و شێوێنەری ئاین دەناسرێ! هەتا دەگاتە سەر خاتەمی

پێغەمبەران محمد المصطفى ﷺ، کەبەشێتو جادووگەرو دەیان ناوو ناتۆرەی ناشیرین هەوڵی لەکەدارکرنی کەسایەتی ئەو گەورە کەسایەتیەیان دەدا.

بەداخەوە ئەمڕۆش کەسانێك هەن هەمیشە خەریکی لەکەدارکردنو ناشیرین کردنی بانگخوازانو زانایانو دڵسۆزانو دەیانەوێ بەهەر بوختانو قسە بۆ هەڵبەستنێك بێت، بێ شەرمانە هەوڵی خۆیان بدەنو ناشیرینیان بکەن. بەڵام ئەوە ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگرە کە: هەرکەس بیەوێت کەسایەتی خاوەن کەسایەتیەك بشێوێنێ، خۆی ئابڕوی دەچێو سوك دەبێو.. کەسی پاکیش هەمیشە بێ باکە..

ئەم نوسراوەی بەردەستیشت هەندێ بابەتە لەوبارەیەوە، کەکاتی خۆی لەسەر مینبەر لەوتاری ڕۆژانی هەینیدا خوێندومنەتەوە.. پاشان برای بەڕێزم گەنجی خەمخۆر (کاك مەریوان) پێشنیاری کرد کەوەکو چۆن ئەو زنجیرە وتارەی (کەسایەتی) بە دەنگ بڵاو بۆتەوە با بشکرێ بەنوسین.. ئەوەبوو لەلایەن (کاکە ئیحسان) لەدەنگەوە خرایە سەر کاغەزو پاشان پێیداچومەوەو سەرچاوەکانم دیاری کردن.. پاشان کاك مەریون هەستا بەکاری هەڵەچنیو لابردنی نوسینە زیادەکانو دانانی ناونیشانی ناو کتێبەکەو نەخشاندنی نوسینەکە.. دواتر بەفەزڵی خوا ئەم بەرهەمەی لێدەرچوو کەلەلایەن پرۆژەی گەشەوە چاپو بڵاو دەکرێتەوە. بەئومێدی ئەوەی کەخوای گەورە بیخاتە توێشەبەرەی قیامەتمانەوەو لەدنیادا بەکەسایەتیەکی تۆکمەو دامەزراو لەسەر ئیسلامو خواناسیو کوردایەتی ڕاستەقینەو پاکوبێگەرد بژینو لەدوای مردن ناومان بەچاکەو خێر ببرێ.

داواکارم لەخوای گەورە کەسایەتی خۆمو باوکمو دایکمو هاوسەری بەڕێزم (سێوەخان)و کاکە محمدو ئیبراهیمی کوڕمو ئاسودەو ئەڤینی کچم بپارێزێ لەهەر کەمو کوڕیەك کەدڵی دۆستانی پێ تەنگو دڵی ناحەزانی پێ خۆشحاڵ بێ.. ئامین.

فاتیح شارستێنی، ٢٠١٦

## خاڵە بنەڕەتیەکانی ئەم بەشە:

❁ **قالَ اللهُ تَعالى:** ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا﴾ **الإسراء: ٧٠.**

✡ **عَنْ حُذَيْفَةَ، قالَ، قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ (لا يَنْبَغي لِلْمُؤمِنِ أنْ يُذِلَّ نَفْسَهُ، قالوُا: وَ كَيْفَ يُذِلُّ نَفْسَهُ؟ قالَ: يَتَعَرَّضُ مِنَ البَلاءِ لِما لا يُطيقُ). رَواهُ الترمذي (٢٢٥٥) وَ اللفظ لَهُ، وَ قالَ: حَسَنٌ غَريبٌ، إبْنُ ماجَة: (٤٠١٦) وَ الصَّحيحَة لِلْشَّيْخ الألْباني: (٦١٣).**

✡ **عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ حُيَيٍّ، زَوْجِ النَبِيِّ ﷺ. قالَتْ: كانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مُعْتَكِفاً، فَأَتَيْتُهُ أزوره لَيْلاً، فَحَدَّثْتُهُ، ثُمَّ قُمْتُ لأَنْقَلِب، فَقامَ مَعي لِيَقْلِبَني. وكانَ مَسْكَنُها في دارِ أُسامَةَ بنِ زَيْدٍ. فَمَرَّ رَجُلانِ مِنَ الأَنْصارِ، فَلَمّا رَأيا رَسُولَ اللهِ ﷺ أسْرَعا، فَقالَ النَبِيُّ ﷺ. (عَلى رِسْلِكُما، إنَّها صَفِيَّةُ بِنتُ حُيَيٍّ). فَقالا: سُبْحانَ اللهِ يا رَسُولَ اللهِ. قالَ: إنَّ الشَّيْطانَ يَجْري مِنْ ابْنِ آدَمَ مَجْرى الدَّمِ، وَ إنِّي خَشيتُ أنْ يَقْذِفَ في قلوبِكُما شَرّاً). رَواهُ البُخاريُّ: (٤ / ٢٤٠)، وَ مُسْلِم: (٢١٥٧).**

✡ **هۆکارە سەرەکیەکانی شکاندنی کەسایەتی مرۆڤ:**

١) شکانی سنورە قەدەغە کراوەکانی خوای پەروەردگار.

٢) بڵاوکردنەوەی نهێنی ناو ژیانی هاوسەری.

٣) ئاگادار نەبونی زمان و فڕێدانی قسە (قسە ببیبڕە، ئەمجا بیوێژە).

٤) تەماحکاری و بێ قەناعەتی بەماڵی خۆت و چاوبڕینە دەست و ماڵی خەڵکی.

## سەرچاوەکان:

١) نَظْرَةُ النَّعيم في مَكارمِ أخْلاقِ الرَّسُولِ الكَريم، مَجْموعَة مِنَ العُلَماء. ج١٠، ص٤٥٠٩.

٢) تَلْبيسِ إبْليس بە کوردی، نوسینی: إبن الجوزي، وەرگێڕانی: نوری هەمەوەند. نارین، چاپی یەکەم، ٢٠١٣، لاپەڕە: ٦٤.

٣) مَوْسوعَة: أسْماءُ اللهِ الحُسْنَی، د. محمد راتب النابُلسي. ج١، ص٣٦٦ - ٣٧٨، دارُ المکتبی، سوریَة، دمشق، الطَبْعَة الخامِسَة، ٢٠٠٨.

چێشتی مجێور، هەژار موکریانی.



## هەستەكانی مرۆڤ

خوای پەروەردگار لەناو ناخی مرۆڤدا كۆمەڵێك غەریزەی دروست كردووە، كۆمەڵێك هەستی تێدا دروست كردووە، لە پێناوی كۆمەڵێك ئامانجی بەرزدا، بۆ نمونە: لە ئینساندا هەستی برسیەتی و تینویەتی هەیە، بە بێ ئەوەی كەوا هەستت پێ بكرێت تۆ لە ناخی خۆتدا هەست دەكەیت برسیتە، وە كاتێكیش نانت خوارد هەست دەكەیت تێر بوویت، یان هەست دەكەیت تینوتە، كە تێرت خواردەوە زیاتر ناخۆیتەوە. وەكو ئامێرێ یان سەیارەك نیت گێچێك بە لا قەدتەوە بێت، سەپر بكەیت بزانیت پلەكەی گەیشتۆتە كوێ، ئێمە لەگەڵ ئەم شتانە ڕاهاتووین، تەنها ئەوەندە بەسە ئینسان سوپاسی پەروەردگاری لەسەر بكات‌و، ئیمان بە خالقیێتی پەروەردگار زاتی (الله) –سُبْحانَهُ وَ تَعالی– بهێنێت، چونكە ئێمە خەڵكانێك دەبینین، یان من خۆم بینیومە خەڵكێك هەبووە كاتێك یەك دەماری مێشكی تێك چووە هیچ هەستێكی نەماوە!

لە كۆمەڵێك فلیم و ئعجازی زانستیدا بینیومە، خواردنی بە قاپ ئەدەنێ، بە پەرداخ ئاوی دەدەنێ بزانن تێر دەخواتەوە یان نا، یەعنی هەرچی خواردنێك هەبێ هەتا گەدەی دەتەقێت، هەر بیدەیە، هەر دەخوات! نازانێ تێرە یان نا! بۆیە ئەو ڕێژەی دكتۆر بۆی دیاریكردووە، دەڵێت دوو پەرداخ، پەرداخ و نیوێك ئاو، لەگەڵ قاپێك خواردەمەنیدا، ئەگەر تەواو بوو دیارە تێری خواردووە، چونكە خۆی هەستی پێ ناكات.

بەڵام خوا ئەم غەریزەیەی لە تۆدا دروست كردووە، بەبێ ئەوەی كەوا ئاماژە و سەعات و گێچێكت پێوە بێت، هەست دەكەیت كە پێویستت پێیەتی، وە ئەگەر

لەو برەی خۆت هەستی پێدەکەی خواردت و تێرت خواردەوە، وازی لێدێنیت. ئەگەر خوا ئەم هەستەی دروست نەکردایە، وەکو خۆت نەدەمایتەوە، ئەمە لە پێناوی بەقای خۆتدا خوای گەورە هەستی برسیەتی، وە پاشانیش هەستی تێربوون و تێر ئاوبوونی تیا دروست کردوویت..

پاشان بۆ ئەوەی ئەم مرۆڤە بەقای هەبێ و بمێنێتەوە لەسەر زەویدا، نەش و نما بکات، زیاد بکات، ئەم نەوەیە دەمرێت، نەوەیەکی نوێ لە جێگاکەی بێت، خوای گەورە غەریزەیەکی جنسیو سێکسی تیدا خەلق کردووە، کاتێك کەوا کوڕ و کچ گەیشتە تەمەنی باڵغ بوون هەستی بۆ ڕەگەزی بەرامبەر دەجوڵێت. خوای گەورە ئەم گەرگایەشی لەسەر مرۆڤەکان دانەخستووە، چونکە حیکمەتێکی گەورەی تێدایە، ئەمە ئاژەڵیانە نایباتە سەر، چونکە زەواجێکی شەرعی هەیە کە حیکمەتی خوایی وایە، ئەم کچ و کوڕە بەشەرعی خوا بە ئەوپەڕی ڕێز و حورمەتەوە بەیەك دەگەن، درێژە پێدەری جیلی ڕابردوو دەبن، چونکە کە ئەو زەواجی کرد چینی ڕابردوو نەنە و داپیرە و باپیرە، بەرەو کۆتایی ژیانن، دەبێ ئەمان شوێنەکانیان بگرنەوە..

سەیری ئەم دینە چ جوانکاریەکی تێدایە! خوای گەورە خالقی ئەم مرۆڤە بۆ مرۆڤی دروست کردووە.. لەگەڵ ئەو هەستی خواردن و جنسەدا خوای گەورە هەستێکی تریشی لەناو ناخی ئینساندا دروست کردووە، ئەگەر ئینسانێکی ساغ و سەلیم بێت، چۆن ئینسانی (فیطرة) سەلیم خواردنی پیسی پێناخورێت، بەلأم ئینسانی واش هەیە پاك و پیسی نازانێت، ئینسانی (فیطرة) سەلیم حەزی بە بوونی خۆیەتی، بە بوونی کەسایەتی خۆیەتی، زانایانی دەروون ناس ناویان ناوە بوونی خود، یان بوونی کەسایەتی.

ئەوەی لە کوردەواریدا زۆرتر بەکار دێت، ئەگەر وشەکەش عەرەبی بێت پێی دەڵێن شەخسیەتی هەیە، هەموو ئینسانێك حەزدەکات شەخسیەتیەکی هەبێت، ئەگەر تێر بیت، تێر ئاو بیت، ژن و منداڵت هەبێ، بەڵام کەسایەتی و شەخسیەتت پێشێل بکرێت، هەست بە نوقسانیەك دەکەیت، ئەڵێی ڕێزم لێنەگیراوە، بۆیە ئینسان بەردەوام هەوڵ دەدات شەخسیەتێك بۆ خۆی دروست بکات، بۆیە لە پێناوی ئەوەدا کۆمەڵێك کار ئەنجام دەدات، هەیە تا ئێوارە بلۆك دەکێشێت، بەرد دەکێشێت، بۆ ئەوەی وجودێکی هەبێت لە ماڵەوە، بۆ ئەوەی چاوی لە دەستی خەڵك نەبێت، هەیە پیشەیەکی جوان دەزانێت.

هەیە شەهادەیەکی باش بەدەست دەهێنێت، هەوڵێکی زۆر دەدات، زیاتر دەخوێنێت.

هەیە هەوڵدەدات صیحەت و لاشەی ساغ بێت، خۆی لە نەخۆشی دەپارێزێت.

هەیە بەهێزو قوەتی خۆیەوە شانازی دەکات، هەیە بە نەسەبو بنەماڵەکەیەوە دەڵێ کوڕی فلاَن کەسم، بنەماڵە و عەشرەتی فلاَن کەسم. هەیە شانازی دەکات بە منداڵێکی باشەوە، حەزدەکات نەوەکانی کوڕ و کچی باش بن و ڕەحمەت بۆ دایك و باوکیان بچێت..

ئەمانە هەموو خوا لە ناخی خۆتدا (زەرعی کردوون)، چاندوونی، هەوڵیان بۆ دەدەیت، حەزیان پێدەکەیت، لە پێناوی یەك مەبەستدا، ئەویش شەخسیەتو، کەسایەتیەکت هەبێتو، ڕێزدار بیت..



## دروستکردنی کەسایەتی کارێکی ئاسان نیە

زۆر بەداخەوە هەندێ کەس هەیە نانی بەدەست هێناوە، ماڵ و سامان و ژن و منداڵیشی بەدەست هێناوە، بە پارەکەی، بەڵام لە پێناوی ئەم دووانەدا شەخسیەتی بەداخەوە لەدەست داوە! لە پێناوی ئەوەدا خانوویەکی باش پێکەوە بنێت، پارەی باش کۆبکاتەوە، شەخسیەتی لەناو خەڵکدا لەدەست داوە. هەیە لە پێناوی ژەمێك نان و تەماحێکی ورگدا شەخسیەت و کەسایەتی خۆی دۆڕاندووە، لە ناو خەڵکدا ئەمڕۆ ئەزمەی کەسایەتیەکانە، ئەزمەی شەخسیەتی مەلای باشە، بەرپرسی باشە، کارمەندی باشە، ڕیش سپی بەشەخسیەتە، گەنجی بە ئەخلاقە.. بەدەیان خەڵك هەیە دەمێکە ئیستیقالەی داوە لە شەخسیەت، دەڵێت: بەس پارەت دەستبکەوێت، بەس کۆشکت هەبێ، بەس سەیارەی باشت هەبێت، لە پێناویا چۆن شەخسیەت دەدۆڕێنیت گرنگ نیە!

هەندێ کەس بەسەرو سیمایاندا وا دەبینرێن دەڵێی ئەمە سەرۆك عەشرەتێکی گەورەیە، بەڵام کەسە نزیکەکانی یان ئەوانەی مامەڵەی لەگەڵ دەکەن، دەڵێن: بابە شەخسیەتی چی و ڕەیس عەشیرەتی چی! لە پێناوی پارەیەکی زۆر کەمدا دە جار تەڵاق دەخوات! بۆیە ئەم جۆرە کەسە شەخسیەتی نەماوە، ئەوە من و تۆ نایناسین ئەینا ورد بووە.

دەبێ بەهەستیاری مامەڵە لەگەڵ ئەم بابەتەدا بکەین، بۆیە هەمووی بە پشتیوانی خوا دەکرێت، هیچ کەس ئازایەتی خۆی نیە، بەڵام خوایش عیلم و عەقڵی داوە بە مرۆڤ کە شەخسیەتی خۆت نەدۆڕێنیت، لە دەستی نەدەیت.

## هۆكارەكانی پاراستنی كەسایەتی:

جارێكی تر دوای ئەوەی خوای گەورە فەرمووی: ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ﴾ **الأسراء:** ٧٠. ئەی نەوەی ئادەم تۆ خاوەن رێزیت لای خوا، لای خەلقی خوا رێزت هەیە، رێزی خۆت مەشكێنە، ئەو رێزەش بەدوو شت پارێزگاری دەكرێت:

## هۆكاری یەكەم: پاپەند بوون بە شەرعی خواوە

خوای گەورە كە ئەو قورئان و فەرموودەی ناردۆتە سەر ئەم زەویە، ئەم نور و رۆشناییەی بلاو كردۆتەوە، ئەگەر جێبەجێی بكەیت، شوێنی بكەویتو كاری پێ بكەیت، یەكەم بەرهەمی هەر لە دونیا پێش قیامەت كە بەهەشت جێگاتە، ئەوەیە: شەخسیەتێكی گەورە بۆ خۆت پەیدا دەكەیت، وەك چۆن خوا دەفەرموێت: ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّواْ مِنْ أَبْصَـٰرِهِمْ﴾ نەزەر مەكە، چاوت بپارێزە لە نامەحرەم، ژنی یان پیاوی، كوڕی یان كچی، ئەزانی كە چاوت پاراست خاوەنی چەند شەخسیەتێكی بەرزیت!

هی واهەیە گەنجێكی ئەچێتە ماڵێكەوە، كە دەڕوات دەڵێن: ئەی ڕەحمەتی خوای لێبێت، چ شەخسیەتێكی بەرزی هەیە، چاوی لە ئاست ئافرەتی نامەحرەمی ئەو ماڵە بەرز نەكردەوە. هەندێ خاوەن پیشە هەن وەك: پۆشاك فرۆشی ئافرەتان یان شوفێری تەكسی هەیە چەندین جار كەسو كاری خەڵك لە ئافرەتو منداڵ دەگەیەنن بە چاوی خێلنەتەوە سەیریان ناكەن.. ئەمە قورئان ئەم شەخسیەتەی بۆ دروست دەكات و لەناو سەد كەسدا ئاماژە بۆ ئەو دەكرێت، پێی دەڵێن جێگەی متمانەیە. كەدەڵێ دراوسێی فلانە كەسم، ماڵ و كەسو

کارەکەی خۆی کچەکانی لەگەڵ کچی خۆیدا فەرق ناکات. گەنجەکەش وادەزانێت ئەوەش خوشکی خۆیەتی، کچی دراوسێکەی ئەمە، چونکە بەقسەی قورئانت کردووە کە دەڵێت چاوت بپارێزە لە نامەحرەم، وەك لە فەرمودەیەکیشدا هاتوە دەفەرموێت: (لا يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِإِمْرَأَةٍ) لەگەڵ ژنێکدا لە ماڵێکدا قەت بەیەکەوە مەبە، ئەگەر پیاوێکی مەحرەمی لێ نەبێت..

گەر تۆ خاوەن پیشەیت، جاری واهەیە ئیشێك بۆ ماڵێك دەکەیت، ئەتەوێت پارەیەك کۆبکەیتەوە بە هەر وەزیفەیەك بێت، کەچووی پیاو لە ماڵەوە نەبوو، مەچۆ لە ژوورەوە لێی دابنیشیت، چونکە لەو کاتەدا شەیتانێك، جاری واهەیە شەیتانەکە شەیتانی ئینس نیە، شەیتانی ئینسانە، هات و تۆی لەو ماڵەدا بینی و پیاوی لێنەبوو، دوور نیە هەزار بوختانت بۆ بکرێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر لەوە ترساوە کە ئینسان شەخسیەتی ورد بێت، جارێکیان لە مزگەوتدا ئیعتیکافی دەکرد[1]، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ڕۆژەی بۆ ئیعتیکاف دانابوو، لەو کاتەدا لە دەرگاری مزگەوت درا، یەکێك لە خێزانە بەڕێزەکانی ناوی خاتوو (صەفیە)بوو، دایکی ئیمانداران –ڕەزا و ڕەحمەتی خوای لێبێت–، ئیشێکی بە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ، ئایا پێویستیەکیان هەبووە؟ میوانێکیان هەبووە؟! بەهەر حاڵ کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوتەکە هاتە دەرەوە سەر ڕێگایەك بوو، لەگەڵ ژنەکەیدا وەستابوو، کاتیش درەنگ بووە دوای ئێوارەو خەریکە تاریك دەبێت، دوو کەس بەوێدا ڕۆشتن، دوو ئەصحابە

---

[1] (ئیعتیکاف ئەوەیە: نیەت بهێنیت بڵێیت من ئەمڕۆ تا ئێوارە لە مزگەوتدا بەس بۆ کاری پێویستی، وەك چونە سەرئاو و دەست نوێژ نەبێت، ناچمە دەرەوە. خوایە ئەمڕۆ خۆم تەرخان کردووە لەم مزگەوتەدا عیبادەتی خوا دەکەم).

سەلامیان کردو ڕوویان لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەکرد، چونکە ئافرەتێکی لەگەڵدایە، پێغەمبەری خوا سەلامەکەی ساندنەوە و فەرمووی: وەرن، وەرن.. مەڕۆن.. ئەوە (صەفیە)ی خێزانی خۆمە، وەرن سەیری بکەن، خێزانەکەی خۆمە..

وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، خۆ خوا نەخواستە ئێمە تۆ بڵێی گومانێکمان لە دڵدا بێت بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا ﷺ؟!

فەرمووی: ئەوە شەیتان و نەفسە وەکو خوێن لە دەماری ئینساندا دەگەڕێت، کاتێك کە ژن و پیاوێك بەیەکەوە دەبینێت هەتا جارێك خێرەکەت پێت دەڵێت ئەمانە ژن و مێردن، ئەمانە خوشك و بران، سەد جار نەفس پێت دەڵێت ئەمانە بە خیانەت لێرە وەستاون، دەبێ ئیشیان چی بێت، ئەگەر پێغەمبەر ﷺ لەوە ترسابێت، ئەبێ من و تۆ زیاتر حەزەر بکەین.

بۆنمونە: کاتێك تۆ ئەچیە ماڵێکەوە کە پیاوەکە لە ماڵەوە نەبوو، هەر لە دەرگاکەوە مەچۆرە سەر قادرمەکەش، ڕاسپاردەکەی خۆت بگەیەنەو بگەڕێرەوە، هەرچەند ئەو ژنە تۆ وەکو خوشکی خۆت سەیری دەکەیت، وە ئەو ماڵەش ئەوەندە بە ئەخلاقن تۆ وەکو برای خۆی سەیر دەکات، بەڵام لەو کاتەدا دەرگاکە داخە، بۆئەوەی شەخسیەتت نەشکێت، چونکە تۆ لە پێغەمبەر ﷺ بەرزتر نیت، ئەگەر ئەو خوا نەخواستە لەوە ترسابێت گومانی خراپی پێ ببرێت، یان دوو کارمەند لە فەرمانگەیەکدان، کاتێك ژن و پیاوێك مانەوە بە تەنها، چاك وایە پیاوەکە یان ژنەکە هاوڕێیەکی تر بانگ بکات، یان بڕواتە دەرەوە، یان دەرگاکە پێوە نەدرێت، یان پەنجەرەکە پێوە نەدرێت، پەردەکە دانەدرێتەوە.. نەوەك

خوانەناسێك لەو کاتەدا بچێتە ژوورەوە بڵێ، ئەو دوانەم بەتەنها بەیەکەوە بینیوە، فیتنەیەکی لێ بقەومێت.

**بە چەند دەقیقەیەك شەخصیەتی نەما!**

دکتۆر محمد ڕاتب نابلوسی دەفەرموویێت: (ئینسان دەبێت زۆر بەحەزەر بێت کە شەخسیەتی لە ناو خەڵکدا ورد نەبێتو لەناو نەچێت، چونکە دروست نابێتەوە، دەفەرموویێت: خۆت بپارێزە لە کارێك ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان دەست کەسێك کەوت و تۆ پێی ماڵ وێران بیت). نمونەیەك دەگێڕێتەوە و دەڵێت: کابرایەکی ناسیاوم هەبوو، خوێندکاری زانکۆ بوو، -ئەو ئێستا مامۆستای زانکۆیە لە دیمەشق-، بەهۆی ئەوەی چوار ساڵ لە زانکۆ دەرسم پێ وتۆتەوە، کاتێ بڕوانامەی وەرگرت بانگهێشتی کردم، سەردانی ماڵیانم کردو، ناسیاویەکم لەگەڵیاندا هەبوو. ڕۆژێکیان هات زۆر شپرزە و شپرز حاڵ خواحافیزی لێکردم و وتی: مامۆستا جارێکی کە من و شاری دیمەشق کۆتایمان پێهات، لەوانەیە بەحەیاتی بە خزمەتی جەنابت نەگەمەوە، سەری خۆم هەڵدەگرم..

وتم: پەنا بە خوا کاکە چیت لێقەوماوە؟! ناتوانین هاوکاریەکت بکەین، چ کارێکت کردووە، کەسێکت کوشتووە،؟!

وتی: نەوەڵا، خوا نەخواستە دزیەکت کردووە؟! وتی: نەوەڵا، بەڵام مامۆستا شتێکم لێقەوما کە پێشبینیم نەدەکرد، کاتێك کە خێزانم پێکەوە نا، لەو کاتەدا کە خۆمان وەکو حەلاڵێك بەیەکەوەبووین، شەیتان زەفەری پێ هێنامو کامێرایەکی ڤیدیۆم بە دیار خۆمانەوە دانا، شەیتان ئەوەی لە مێشکمدا دروست کردو هانی دام وتی: کە پیر بوون دەبێتە یادگاری کە گەنج بوون بەیەکەوە

چیتان کردووه، نیشانی بداتەوه، هاته بن کلّیشه‌مانه‌وه تەصویری تەواوی حالّەتی خۆمانم کردووه.

شریتێکم له بازاڕ به ئەمانەت هێنا، چۆن جاران لێره هەبوو، شریتی دەهێنا به پاره و دوای دەیبردەوه، –ئەو کاتانه کاسیەتی فیدیۆیی بووه–، ئەو کاسیەتەم هێنا، قەدەری خوایی کاتێك کاسیەتەکەم بردەوه، سەیر دەکەم ئەو شریتەی خۆمانه، کابرای دوکانداریش داوای ئەو فلیمەی لێکراوه، چەند نوسخەی لەبەر کۆپی کردووه و تەوزیعی کردووه.. هەتا ئەمڕۆ بەیانی براکەم هات وتی: برا چیت لێقەوماوه، وتم بۆ کاکه؟! وتی: من شریتێکم، فلیمێکم بەکرێ خواستووه،که بردوومەته ماڵەوه، سەیردەکەم خۆ ئەوه براکەی خۆم و براژنمه بەڕوتی بەیەکەوه، ئێستا دەبێت چەند ماڵی کەی کردبێت؟!

لەبەر ئەوه مامۆستا وازم له خانوو له ماڵ و، له هەموو شتێك هێنا، دەڕۆم بۆ لادێیەکی وا، لەم ولاّتەدا لەم سوریایه، که جەوازم نیه بڕۆمه دەرەوه، ئەینا سەری خۆمم هەڵدەگرت، که جارێکی که کەسێکی تر لەم ولاّته من نەبینێتەوه، وه دوا جار خواحافیزیت لێدەکەم!!

### بێ ئەمری شەرع شەخصیەت لەناو دەبات

ئەبێ وریا بین، زۆر ترسناکه، لەیەك جاردایه شەخسیەتی ئینسان لەدەست دەچێت، شەرعه پێت دەفەرمووێت: ئەگەر دوکانداریت، ئەمین و ڕاستگۆبەو دەست بڕ مەبه، چونکه یەکجار لێت بیسترا که دەستی فلاّنه کەست بڕیوه، متمانەت نامێنێت لەناو خەڵکدا، خۆ هی واهەیه هەموو جارێك فێڵی نەکردووه، لەناو خەڵکدا دەستی یەك دوو کەسی بڕیوه له مامەڵەدا، تاماوه متمانەی

پێناکرێتەوە. هەروەك دەوترێت: کراسێکت بە پیسی دڕی، هەزار بە پاکی بدڕی جێگەی ناگرێتەوە. شەرع دەفەرموویێت: ڕاستگۆبە، چونکە کەسی درۆزن متمانەی نیە، شەرع دەفەرموویێت: داوێن پاك بە، چونکە کەسانی داوێن پیس خەڵك خۆیانی لێدەپارێزێت، ناوێرێت بیباتە ناو ماڵ و عائیلەیەوە، زۆر جار ئینسانی مسوڵمان ئەبێ وریای قسەکانیشی بێت، جاری واهەیە بەیەك قسە کەسایەتیت پەنا بە خوای پەروەردگار لەدەست دەدەیت.

### بەیەك قسە کەسایەتی خۆی دۆڕاند!

لە ئەم ساڵی ڕابردوو ڕوویداوە، مامۆستایەکی بەڕێز بۆی گێڕامەوە کە خزمی یەکێك لەو لایەنانەیەو دەیوت ماوەیەکی زۆر پێوەی خەریك بووین. بەسەرهاتەکە وا ڕوویداوە، دوو برادەر کە پێشمەرگە دەبن لە مەقەڕێکدا بەیەکەوەن، هەردووکیان خەڵکی شوێنێکن، شارۆچکەیەکن، یەکێکیان مۆڵەتێك وەردەگرێت، سەرێکی ماڵەوە بداتەوە، دەڕواتەوە بۆ ماڵەوە.. لەو کاتەدا کە دەچێتەوە ماڵەوە قەدەری خوای پەروەردگار تەلەفۆن بۆ خێزانی دەکات، دەڵێت وا منیش دێمەوە، کە دێتەوە جلێکی کوردی لەبەردایە و خزمێکیان، دراوسێیەکیان، شاییان هەبووە، بانگیان کردوون بۆ کاتی بوك گواستنەوە، ئەمیش بەو جلانەوە دێتەوە بۆ ماڵەوە..

کابرا دەمێکە خێزانی خۆی نەبینیوە، ماوەی نزیکەی دە پانزە ڕۆژێکە لەماڵ نیە، ئەمە لەڕووی شەرعیەوە خۆ خیلافێکی تێدا نەبووە، لەگەڵ خێزانەکەیدا دروست دەبێت هەر بەو جلانەوە، دواتر بۆ ڕۆژی دوای دەڕواتەوە، برا دەرەکەی

بەخێرهاتنەوەی دەکات لە مەقەرەکە، کۆمەڵێك پێشمەرگەش بەدەوریانەوەن، دەڵێت: چۆن بوو، باش بوو چویتە ماڵەوە، دڵت ئیسراحەتی کرد؟

دەڵێت ئەرەوەڵا، هەتا تەنانەت دەستم لە جلی ژێرەوەی ژنەکەت دا !!

—ئینسان جاری واهەیە لەیەك قسەدا دەدۆڕێت— هەر پەلاماری تفەنگ دەداتو کۆمەڵێك برادەر دەکەونە بەینیانەوە و نایەڵن لەوێ بیکوژێت، دەڵێت: دەستت لە جلی ژێرەوەی ژنەکەی من داوە؟! کەوا بێ چووی خیانەتت لەگەڵ خێزانی من کردووە، هەی نامەرد، هەی ناپیاو، چونکە تۆ برادەری من بویت، ئەڵێ کوڕە کاکە ڕاوەستە ئێستا بۆت ڕوون دەکەمەوە، پەلاماری دەدرێ و پیاکێشان دروست دەبێت، فەرماندەکەیان هەردووکیان دەگرێت و دواتر ڕەوانەی ماڵەوەیان دەکاتەوە، ئیتر بۆ خۆیان بچن ئەم کێشە لە مەقەرەکە لابەرن و با یەکێکیان یەکتر نەکوژێت، کاتێك کابرا دێتەوە ماڵەوە یەکسەر دەڕواتەوە بۆ ماڵەوە و دایکی لەگەڵ خێزانەکەیدا دەژیا، کابرای کە قسەکەی پێگوتراوە دەڵێت: دایکە، کوا خێزانم؟!

دەڵێت: وەڵا چووە بۆ بازاڕ شت بۆ منداڵەکان بکڕێت، خاوەنی سێ منداڵیشە، دەڵێت: دەی تۆ بە شاهید بە وا سێ بە سێ من هەر ژنەکەم لە مەقەرەوە تەلاق داوە، دەڵێت: بۆ خاتری خوا، ئاخر کوڕم چی بووە، ئاخر تۆ نابێت بزانیت، تۆ شێت بوویت، تێکچویت، خۆ تۆ لە ماڵ نەبوویت.

دەڵێت: ئەم نامەردەی خێزانم لەگەڵ ئەو نامەردەی برادەرمدا دەستی تێکەڵاو کردووە، لە ناو ئەو هەموو خەڵکەدا پێی گوتم دەستی لە جلەکانی ژێرەوەی دراوە..

دەڵێت: کوڕی خۆم وەڵڵاهی ئەو ژنەی تۆ فەقیرە، مەگەر تا بازاڕ چووبێت، ئەویش لەگەڵ خەڵکدا، ئەینا لەم ماڵەدا ئێمە شەو و ڕۆژ بەیەکەوەین، وەڵڵاهی پیاوێکی نامەحرەم ئەو برادەرەی تۆ، کە بەیەکەوەن دەرگای ئەم ماڵەی نەکردۆتەوە، کە هاتۆتەوە هەر سەردانیشی نەکردووین، هەر هەواڵپرسیشی نەکردووین..

دەڵێت: نەخێر من تازە بڕیاری کۆتایی خۆم داوە، ژنە دێتەوە و هەر لە دەرگاوە نایەڵێت عەلاگەکانی لەدەست فڕێ دەدات و دەڵێت: تۆ تەڵاق دراویت، بڕۆوە، بڕۆ بۆ لای ئەو کەسەی کە دەستی لە جلەکانت داوە، ئەویش دەڕواتەوە بۆ ماڵی باوکیوهیراکانی دەڵێن: حەیامان مەبە، بزانین کار چیە؟ دەڵێت حاڵ و مەسەلە وایە، ئەوانیش دەڕۆنە سەر ماڵی فلانە کەس و خەریك دەبن بیکوژن، کۆمەڵێك دەر و دراوسێ و پیاوماقوڵ نایەڵن، کاکە چی بووە؟! چۆن ئەم قسەیەت کرد؟

دەڵێت: وەڵڵاهی کە چوومەوە ژنەکەم هاتەوە لەو شاییە، منیش لەوێ لەگەڵیدا دروست بووم، پێم وت ئەم جلە جوانانەت نەبوو، هی کێیە؟ وتی: هی ژنی فلان کەسە، لێم خواستووە بۆ ئەم شاییە، بە خوا خۆم جلێکی وام نەبووە، پیاوەکەش دەڵێت من بەو قسەیەم کردووە، جلەکان هی ژنی فلانە کەس بووە، بەس من لەبەر لاشەی ژنەکەی خۆمدا دەستم لێداوە، کابرا دەڵێت کۆتای پێ هاتووە، من ڕێزم شکاوە لەناو خەڵکدا، هەتا هەتایە ژنەکەی تەڵاق دا، وتی تەقریبەن یەك مانگ بە کۆمەڵێك پیاو ماقوڵ و مامۆستای ئاینی تا بە پێنج دەفتەر دۆلار سوڵحی ئەو عەشیرەتە کراوە، کابرا وتیان لێی خۆش نابێت حەیای خوشکەکەمانی بردووە لەسەر جلێکی خواستراو!

بۆیە زانایان وتوویانە: ئینسان سێ جۆرە:

١- هی واهەیە زاناشە و عاقڵیشە، پێش ئەوەی شت ڕووبدات ناهێڵێت ڕووبدات، پێش ئەوەی ڕووبدات بەربەستەکەی دروست دەکات، دەڵێت وا لافاوێك دێت هێشتا نەگەیشتووە ئەم سەدی بۆ دادەنێت.

٢- هی واهەیە زانا نیە، بەس عاقڵە، کە ڕوویدا نایەڵێت خراپتربێت، لە کاتی ڕووداندا بەربەستەکەی بۆ دادەنێت.

٣- هی واهەیە دوور لە ڕوتان ئەحمەقە، شتەکە ڕوودەدات ئەنجا هەوڵدەدات چارەسەری بکات، کە ڕوویدا چارەسەر زۆر زەحمەتە، لەبەر ئەوە هەوڵبدە پێش ئەوەی ڕووبدات چارەسەری بۆ دابنێیت، ئەنجا گرنگ ئەوەیە ئێمە سەیر بکەین ئایا شەخسیەتی ئینسان تۆ وەکو خۆت شەخسیەتت بە شتێکەوەیە لەناو دەچێت.



## شەخصیەت لەمادەدا نیە

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: یەکێك لە نیشانەکانی قیامەت ئەوەیە: کەسایەتیی‌و شەخسیەتی ئینسان (شَخصیَّتُهُ مَتاعُهُ) کەل و پەلەکەیەتی، ئەمڕۆ نابینین دەڵێت بەخوا ئەم سەیارەیە شەخسیەتە، ئەبێ سایەقەکەی شەخسیەتی هەبێ نەك سەیارەکە، ئایا ئەگەر سەیارەکەشت لەدەست دا خۆ ئەگەر هەبێ پیرۆزت بێت، ڕێگر نیە لە ڕووی شەرعیەوە، شتێکی باشت هەبێت، بەڵام ئامان ئاگات لەوەبێت هەموو شەخسیەتی تۆ سەیارەکەت نەبێت، خۆ ئەگەر سەیارەکە سوتا، دەعمی کرد، فڕێ درا، بە پێیانیش ڕۆشتی هەر ئەو شەخسیەتەت لەناو خەڵکدا ماوە وەکو جاران، یان هەر خەڵك بەهۆی حورمەتی سەیارەکەتەوەبوو، کە سەیارەکەت ئاخر مۆد و بەرز بوو، بایی چەند دەفتەر دۆلار بوو، وریابە شەخسیەتی تۆش سەیارەکە نەبێت، خۆت بیت.

## پێوەرەکانی تێکچونی کەسایەتی

هی واهەیە شەخسیەتەکەی تەنها خانووەکەیەتی، دەڵێت بەخوا فلان کەس زۆر شەخسیەتدارن، لە فلان گەڕەکی ڕاقی خانوویان هەیە، لەسەر جادەی شەست مەتری فلان شوێن، هی واهەیە چۆتە خوازبێنی کچ ئەڵێن کوڕێکی چۆنە؟ دەڵێن کورە هەر لێی مەپرسە لە گەڕەکی فلان شوێن دەژین، ئەوەی پیاوە دەوڵەمەندەکانی لێدەژیا، کەواتە شەخسیەتەکەی سەیر نەکرد، شەخسیەتەکەی لە خانووەکەیدا سەیرکرد، کە ماڵی لە فلان گەڕەکە، بەڵام ئەگەر لە خانووە قوڕەکان بێت، بەو چاوەوە سەیری ناکەن، ئەمە یەکێکە لە نیشانەکانی ئاخر

زەمان، هی واهەیە جلێکی شاڵی لەبەر دایە و کڵاشێکی تازەی لەپێدایە، خەڵك دەڵێت بە خوا ئەمە لەوانەیە زۆر کەسێکی پلەدار بێت، ئایا ئەگەر جلێکی شڕی کرێکاریشت لەبەردابوو هەر ئەو شەخسیەتەت ماوە لەناو خەڵکدا؟! ئەگەر ئەو کاتە هەتبێت، ئەمیشیانت لێ موبارەك بێت، بەڵام ئاگات لە خۆت بێت شەخسیەتەکەت هەر جل و بەرگەکە و پێڵاوەکەت و کڵاشەکەت نەبێت، ئەگەر بە جلی کرێکاری و پێڵاوی لاسیکیشەوە خەڵك بینی هەر ئەو حورمەتەت لەناو خەڵکدا لێبگیرێت، ئەمەیان شەخسیەتە، ئەمجا جلە جوانەکەت لەگەڵیا پیرۆزە، بۆ ئافرەتێکیش ئەگەر ئەو شتە هەبێت هەروایە، ئەگەر وەزیفەیەکت هەیە و خەڵك حورمەتت دەگرێت، دەستت بۆ بەسنگەوە دەگرێت..

بیر لەوە بکەرەوە ئەگەر ڕۆژێك لەو وەزیفەش دەرکرایت، چوویشیتەماڵەوە ئیمزا و مۆرەکەشیان لێسەندیەوە، خەڵك ئەو حورمەتەت هەر لێدەگرێت؟! ئەوەیان شەخسیەتە، ئەمڕۆ هیچ گرنگ نیە، ئەگەر قەڵەمێکت پێیە، مۆرێکت پێیە، ئیشی خەڵك ڕایی دەکەیت، خەڵك زۆر بە حورمەت بێت، گرنگ ئەوەیە ئەگەر مۆرەکەشت لەسەر مێزەکە بەجێهێشت و بەسادەیی چوویتەوە ماڵەوە، ئەوە حورمەتەت هەر لەناو خەڵکدا ماوە، ئەوە شەخسیەتی پێدەڵێن. لەبەرئەوە ئەمڕۆ پێوەرەکان تێکچوون، شتەکان شتی کاتین، کوڕی فلان کەسە، هی واهەیە خۆی هەڵدەکێشێت ئێمە عەشیرەتی فلان کەسین، کوڕی فلان کەسین.. ئەوە گرنگ نیە، چونکە باوباپیرانی تۆ دەمرن، گرنگ خۆتی دەمێنیەوە.

مامۆستا هەژاری موکریانی ڕەحمەتی خوای لێبێت بە کوڕەکەی دەڵێت: کوڕی خۆم شێرکۆ، ئاگاداربە قەت خۆت بەوە هەڵمەکێشە بڵێی من کوڕی فلان کەسم، هەوڵبدە لە ناو خەڵکدا کە خەڵك تۆ و باوکیان بەیەکەوە بینی، بڵێن ئەها ئەو

مامه حاجیه له خوا بەزیاد بێت باوکی ئەم کوڕە ڕەوشت بەرز و ئەخلاق بەرزەیە، بۆ خۆت ئەوەندە دیار بە لەناو خەڵکدا، ئەوەندە خاوەن سیقە و متمانە و شەخسیەت بە، خەڵك شانازی بکات باوکت کە بڵێت کوڕەکەم فلآن کەسە، نەك شانازی بەوە بکەی من کوڕی فلآن کەسم، کە بۆ خۆت هیچ نەبیت با هەر کوڕی فلآن کەس بیت، ئەوەندە کار بکە خۆت بە باوکتەوە قەت هەڵمەکێشە، بە عەشرەت و بنەماڵەتەوە، کارێکی وا بکە کە ئەوەی دروست کراوە لە ڕابردوودا تۆ وێرانی مەکە..

هەیە خۆ بنەماڵەکەی زۆر بەڕێزن، خاوەن دین بوون، خاوەن حورمەت بوون، خاوەن دیوەخان بوون، کەچی ئەولادەکە هەمووی ڕوخاند، دەی تۆیش هەوڵبدە قاتی یەکەمیانت بۆ دروست کراوە، ئەگەر مەردیت تۆش قاتی دووەم دروست بکە، با ئەم شەخسیەت و ڕێزەت بەردەوام بێت، با ئەو سایە و سێبەرەت لەسەر خەڵك هەتا هەتایی بێت.



## هۆكاری دووەم: بەقەناعەت بەو چاوت لەبەشی خۆت بێت

ئەو شتەی شەخسیەتت بۆ دروست دەكات، كەسایەتیت دەپارێزێت، بریتیە لەوەی چاوت لەو بەشەی خۆتەوە بێت، چاوت لەو ماڵەی خۆتەوە بێت كە خوای گەورە پێی ڕەوا بینیوی، تموحی زیادە مەكە، زانایەكی گەورە هەیە ناوی فەتحی موصلّیە، یەكێكە لەوانەی كە لە زۆربەی كتێبە شەرعیەكاندا قسەی زۆر نایاب و جوان و دانسقەی هەیە، زۆر ورد بین بووە، دەفەرمووێت: ڕۆژێكیان ئەچووم بۆ مزگەوت، دوو منداڵ حەوت هەشت ساڵانە هاتبوونە دەرەوە لە كۆڵاندا یاریان دەكرد، هەردووكیان دیار بوو دایكیان ئەو زەمەنە هەموو ژەمێك نان كراوە، كولێرەیان پێبوو، بەڵام یەكێكیان كولێرەكەی بە وشكی پێبوو..

یەكێكیان دایكی هەندێ ڕۆنە كەرەشی لەگەڵدا دابوویە، بە ڕۆنە كەرەوە لە قاپێكدا كولێرەكەی دەخوارد، ئەوەی كولێرەكەی بە وشكی دەخوارد، بە ڕەفیقەكەی وت: وتی تو خوا تۆزێك ڕۆنە كەرەم ئەدەیتێ، با منیش بە وشكی نەیخۆم؟

وتی: نایدەم، وتی: نا تو خوا پیاوەتی بكە، منیش حەزم لێیەتی، وتی: بەیەك مەرج، بۆم ببیت بە سەگ.. وتی: چۆن؟ وتی: وەرە پەتێك دەكەمە ملتەوە، بۆم بوەڕە وەكو سەگ، منیش لەو ڕۆنەكەرەی خۆم نیوەت دەدەمێ..

وتی: ئامادەم، پەتێكی هێناو منداڵەكەی پەت كردوو، وەكو سەگ بەدوویدا دەوەڕی، ئەویش هەندێك ڕۆنە كەرەی دایە!

دەڵێت كە ئەوەم بینی وتم: ئای تموح، ئای بێ قەناعەتی، خۆ ئەمە هەر بۆ منداڵەكە بێت، منداڵەكە بۆ نەفسیەتیەك وای كردبێت، بەڵام هەیە گەورەشە، بۆ

پارووپەك نان وەكو سەگ بە دەوری ماڵی خەڵكدا دەوەڕێت، پیاوی مەرد و پیاوانە پاسەوانیشی بكەیت عەیب نیە، بەلاّم پارێزگاری داوێن پیس و عارەق خۆر و شەرواڵ پیس و دز و گەندەڵ، وەكو ئەو سەگە وایە كە بەدەوری ماڵەكە دا پاس دەكات، هیچ جیاوازی نیە. ئا لەو كاتەدا دەڵێت: زۆر خەمم خوارد، مرۆڤ ئەوەندە لە پێناوی تموحێكدا، لە پێناوی پارووپەك ناندا كەسایەتی خۆی ورد بكات، وەكو سەگ بەدەوری خەڵكدا بسوڕێتەوە..

## نابێ كەسی مسوڵمان خۆی زەلیل بكات

پێغەمبەی خوا ﷺ فەرمووی (**لا يَحِلُّ لِمُؤمنٍ انْ يُذِلَّ نَفْسَهُ**) حەلاڵ نیە ئەی ئینسان، خوا ڕێی پێنەداوی نەفسی خۆت بشكێنیت و شەخسیەتی خۆت ورد بكەیت، (**قالُوا يا رَسُولَ اللهِ وَما إِذْلالُهُ نَفْسَهُ**)؟! ئەی پێغەمبەری خوا بۆمان ڕوون بكەوە ئینسان چۆن شەخسیەتی دەشكێت، چۆن كەسایەتی لەدەست دەدات؟ فەرمووی: (**يَتَعَرَّضُ مِنَ البَلاءِ لِما لا يَقُومُ لَهُ**) خۆی دەخاتە مەوقیعێكەوە، شوێنێكەوە، كارێكەوە، كە توانای هەڵگرتنی نیە و لە دوایدا ئابڕووی دەچێت و شەخسیەتی ورد دەبێت..

بۆ نمونە: هەوڵ بدە مەچۆ بۆ مەجلیسێك، نانی پیاوێك مەخۆ كە هێندە دەوڵەمەند بێت، ئەوەی كە ئەو ژەمێك لەسەر سفرەكەی دەخورێت، تۆ بە یەك مانگ بە ماڵ و منداڵت نایخۆیت، ئاخر سفرەی واهەیە ئەوەی بەیەك ژەم لەسەری هەڵدەگیرێتەوە، من و تۆ ڕەنگە بەیەك مانگ ئەو مەسرەفەمان نەبێت، ئەو هەر بەیەك ژەم دەیخوات، قەت مەچۆ لەسەر ئەو سفرە نان

مەخۆ، چونکە خوا نەخواستە ئەگەر ڕۆژێك فلآن کەس هات بوو بە میوانت، مەسرەفی یەك مانگی خۆت و ماڵ و منداڵتی بۆ بخەیە بەردەم، هێشتا لێشت مەمنون نیە، چونکە ئەو هەموو ڕۆژێك سفرەی وا ڕازاوەیە، کەواتە ئابڕوت چوو، شەخسیەتت ورد بوو، لەگەڵ کەسێکدا نان بخۆ، لەگەڵ کەسێکدا هاتوو چۆ بکە، کە وەکو خۆت بێت، کە هاتەوە ماڵەوە سەر سفرەت سفرەی تۆش وەکو ئەو بێت، شەرمەزاری ڕوت تێنەکات، نەزانی چی بکەیت و بۆت قەرەبوو نەکرێتەوە..

کەسێك دەیەوێت خوازبێنی ئافرەتێك بکات، کچێك بێنێت و بیکات بە هاوسەری ژیانی خۆی، مەچۆ کچی پیاوێك بخوازیت کە بە نۆکەری خۆیت نازانێت، هەموو ڕۆژێك بە خزمەتکاری بەردەرگاکەشی ڕات ناگرێت، بچۆ کچی پیاوێك بخوازە کە وەکو خۆت، هاوشانی خۆت بێت، لە خۆت ئەوەندە دەوڵەمەند تر نەبێت، بڵێ برۆ سەیارەکەم بۆ بشۆ، هێندە بە چاوی بێ ڕێزی سەیرت بکات، بڵێ کوڕم ئەوە سویچەکەو تۆش وەکو کوڕی ماڵەکە وایت، ئەوەیان هەڵبژێرە، وە کچەکەش تۆ شوو بە ماڵێك مەکە، کە بە قەرەواشت ڕات نەگرن، شوو بە کوڕی ماڵێك بکە کە هاوشانی خۆت بێت، چونکە بە دەستی خۆت خۆت سووك کرد، ئەو بە خزمەتکاری ماڵەکەشی ڕات ناگرێت، ڕەنگە کوڕەکەیان لەبەر موعجیبی جوانیەکەت بێت، هەولّبدە ئەگەر هاوشانی خۆت نەبوو، خۆت مەخە ڕیزێکەوە کە دوای وەکو خزمەتکاری ماڵ سەیرت بکەن، لە ماڵەوە خۆت مەشکێنە.

دەچیتە لای بەرپرسێك، ئەگەر بە حیمایەی خۆیشی تۆی قبوڵ نەبوو، ئەوەندە بە چاوی سووك سەیری کردیت، لەلای خوارەوە دانیشتی، نەیوت فەرموو وەرە سەرەوە تۆزێ لە مێزەکەی نەجولا، هیچ ڕێزێکی نەنواند، قەت

جارێکی دیکە سەردانی مەکەوە، چونکە ئەو تۆ بە حیمایەیش قبوڵ ناکات، قەت مەڵێ جەناب، کیتابەکە بدە بە کەسێك بڵێ برۆ ئەو ئیمزایەم بۆ بکە، بەڵام چاوم با بەچاوی نەکەوێت، چونکە نەوەك بە چاوی سووك سەیرم بکات. خۆت مەخە شوێنێکەوە، مەچۆ بۆ ماڵێك کە لە تۆ پێی خۆشتر نەبێت، کە سەردانت کردووە، کە ڕووی گرژ بوو هیچ حورمەتی بۆ دانەنایت، چونکە بە دەستی خۆت خۆتت شکاندووە، هەوڵبدە شەخسیەتی خۆت بپارێزە.





# بەشی دووەم

# بۆ پاراستنی کەسایەتیت، تەنها پشت بە خوا ببەستە

## خاڵە بنەڕەتیەکانی ئەم بەشە:

❁ **قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَ تَعالى:** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَسْبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ **الأنفال:** ٦٤.

❁ **وَ قالَ اللهُ تَعالى:** ﴿أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ ۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ﴾ **الزُمَر:** ٣٦.

❁ **وَ قالَ اللهُ تَعالى:** ﴿وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ﴾ **الحج:** ١٨.

۞ **في أُحُد، قالَ أَبو سُفيان: أَفي القَوْمِ مُحَمَّد؟! قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ (لا تُجيبُوهُ) فَقالَ: أَفي القَوْمِ إبْنُ أَبي قُحافَةَ؟ قالَ: لا تُجيبُوهُ، فَقالَ: أَفي القَوْمِ ابنُ الخَطّاب؟ فَقالَ: إنَّ هؤلاءِ قُتِلُوا، فَلَوْ كانُوا أَحْياءَ لَأَجابُوا، فَلَمْ يَمْلِكْ عُمَر نَفْسَهُ، فَقالَ: كَذَبْتَ يا عَدوَّ اللهِ، أَبْقَى اللهُ عَلَيْكَ ما يُخْزيكَ. قالَ أَبُو سُفيان، أُعْلُ هُبَل، فَقالَ النَبِيُّ ﷺ: أَجيبُوهُ، قالُوا: ما نَقُولُ؟ قالَ: قُولُوا: اللهُ أَعْلى وَ أَجَلَّ، قالَ أَبُو سُفيان: لَنا العُزَّى وَلا عُزَّى لَكُمْ، فَقالَ النَبِيُّ ﷺ أَجيبُوهُ، قالُوا: ما نَقُول، قالَ: قولُوا: اللهُ مَوْلانا وَلا مَوْلى لَكُمْ). رَواهُ البُخاريُّ: (٤٠٤٣).**

۞ **قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (إنَّ الحلالَ بَيِّنٌ، وَ إنَّ الحَرامَ بَيِّنٌ، وَ بَيْنَهُما مُشْتَبِهاتٌ، لا يَعْلَمُهُنَّ كَثيرٌ مِنَ النّاسِ، فَمَنِ اتَّقى الشُبُهاتِ، اسْتَبْرَأَ لِدينِهِ وَ عِرْضِهِ). رَواهُ البُخاري وَ مُسْلِم.**

۞ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (مِنْ حُسْنِ إِسْلامِ المَرْءِ، تَرْكُهُ ما لا يَعْنيهِ). رَواهُ مالِك في المُوَطَّأ: (٢ / ٦٨٩). وَ اللفظُ لَهُ. وَ الترمذي: (٢٣١٨)

**سەرچاوەکان:**


١) خُطب الشَّيْخ محمد حسين يعقوب، ج٢، ص١١٦.

٢) الوافي في شرح الأَرْبَعينَ النَوَوِيَّة، د. مصطفى البُغا، محى الدِّين مستو، ص٣٥، دار الكلم الطَيِّب، ديمشق، ط: ٧، ١٩٩٧.

٣) ڕۆژنامەی کۆمەڵ، ژ: ٣٨٧ لە ٢٢ / ٨ / ٢٠٠٩، وە ژمارە: ٤٧٣، لە ١٧ / ٥ / ٢٠١١.

٤) ڕۆژنامەی یەکگرتوو، ژ: ٨٤٠ لە١٦ / ٥ / ٢٠١١، باسی کۆسەی هەجیج.

٥) گۆڤاری: (لڤین بونیاد) ژ: ٢، ئایاری ٢٠١١، ل٤ (بابەتی گەندەڵی و دزی لە عێراق).

٦) تەفسیری کوردی، مەلای گەورەی کۆیە، ب٦، ل١٧٠.




خوای پەروەردگار بۆ مانەوەی کۆمەڵی مرۆڤایەتی لەسەر زەویدا ئارەزووی جنسی لە مرۆڤدا دروست کردووە لە بەینی نێر و مێدا، کە لە ئەنجامی ئەو بەیەك گەیشتنە کە ڕێگای شەرعی بۆ دانراوە، مرۆڤایەتی مانەوەی دەبێت. غەریزەیەکیش لەناو ناخی ئینساندا هەیە کە بریتیە لە شەخسیەت، لە کەسایەتی، یان لای خۆمان دەڵێن سەمعە.

ئینسانێك شکۆی هەبێت، ڕێزی هەبێت، کەسایەتی نەشکێنرێت، هەموو کەسێك لەناخی خۆیدا ئاواتە خوازی ئەوەیە سەمعەی پارێزراوبێت، تەنانەت ئەبینی منداڵێك کە فیطرەتی پاکە، لە مامۆستاکانی ڕەوزە بپرسن ئەو ڕووداوانەتان بۆ دەگێڕنەوە، جاری واهەیە منداڵێك قەڵەمی هاوڕێیەکی منداڵی وون بووە، هەڵی دەگرێتەوە و دەیخاتە جانتاکەیەوە، دەیخاتە گیرفانیەوە، کاتێك کە مامۆستاکە دەڵێت کێ قەڵەمێکی دۆزیوەتەوە، ئەم پێی جوانە و قسە ناکات، وەختێك کە دەرگاکە دادەخات و هەموو گیرفانەکانیان دەگەڕێت و جانتاکانیان تەماشا دەکات لە گیرفانی ئەو منداڵە و جانتاکەیدا ئەو قەڵەمە دەدۆزێتەوە، ئەو منداڵە بەو بچوکیە هەست بە خەجاڵەت بوون دەکات، یەکسەر هەموو لەشی عارەق دەکاتەوە و سور هەڵدەگەڕێت و دەترسێت!

یەعنی لە ناخیدا هەست دەکات کەسایەتی لەکەدار بووە، شەخسیەتی شکاوە، دزی لەسەر ئاشکرا بووە، خیانەتی لێ ڕوودواوە، منداڵێك هەست بەوە دەکات چونکە فیطرەتی پاکە، هەموو مرۆڤێك حەزدەکات بوونی خۆی بسەلمێنێت، شەخسیەتی خۆی لە کۆمەڵگادا بسەلمێنێت.

## بۆ پاراستنی شەخسیەتمان خودامان بەسە:

گەر کەسێك بیەوێت شەخسیەتی هەبێت، سەمعەی پارێزراو بێت، ئەبێ خۆی بداتە پاڵ خوای پەروەردگار، ئەو خوایەی کە دەفەرموێت:﴿قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلۡمُلۡكِ تُؤۡتِي ٱلۡمُلۡكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلۡمُلۡكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُۖ بِيَدِكَ ٱلۡخَيۡرُۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٢٦﴾﴾ آل عمران:٢٦.

خوایەك کە (مالِكُ المُلك)ە، هەرچی بوونە، هەرچی دیارە، هەرچی نادیارە، ئەوەی کە ئێمە لەم ئەرز و ئاسمانەدا بەرچاوت دەکەوێت، ئەوەی کە زانست پەی پێ بردووە، وەکو ئەوە وایە ئەڵقەیەك فڕێدەیتە بیابانێکی گەورەی بێ شومارەوە، ئەوەی کە ئێمە لەبەر چاومانە لە ئاسمانەکانیشدا، بەقەدەر ئەو تۆزە وایە، وەکو لەتە نیسکێك وایە لە بیابانێکدا کە وجودی نیە، ئەوەندەی تری هەر نازانرێت، هەر زانست نایدۆزێتەوە، هەتا دونیا کۆتایی پێ دێت نازانرێت هەیە یان نیە. خوایەك کە (مالِكُ المُلك)ە، خوایەك کە (مُعز)ە، ئەوەی بیەوێت بەرزی دەکات..

خوایەك کە (المذل)ە، دەسەڵاتداری ستەمکار زەلیل دەکات..

خوایەك کە (یُحیی وَ یُمیت)ە، بۆ خۆی (حَيٌّ لا یَموت)ە، مردن و ژیانی بەدەستە و نە دەمرێت و نە مردنی بەسەردا دێت، بەردەوام زیندووە. ئینسان دەبێت تەوەکوولی لەسەر ئەو خوایە بێت کە (الرزاق)ە، ئەوە کە (الفتاح)ە، ئەوە کە (الجبار)ە، کە (القهار)ە.. ئەگەر ئاوابوویت، بەردەوام دڵت لەگەڵ ئەو پەروەردگارەدا بوو، عیزەت و کەرامەتت دەپارێزرێت.

خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ حَسْبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ الأنفال: ٦٤. ئەی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ خودات بەسە، لەم کاتەدا هەموو دونیا دوژمنی بوو! چەند ناخۆشە گەورە پیاوێکی وەکو پێغەمبەر ﷺ، کافرانێك دەست درێژی بۆ بکەن، شەخسیەتی لەکەدار بکەن. خوا لەو کاتەدا دەفەرموویت: ئەی محمد تۆ خوات بەسە (حَسْبُكَ ٱللَّهُ)، پەیوەندی خۆت لەگەڵ خوا پتەو بکە، پشتی خۆت بەس بە خوا ببەستە، (وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ) کە دوو تەفسیری هەیە: لەگەڵ ئەو کۆمەڵە ئیماندارەی کە بە دەورتەوەن. وە مانای دووەمیشی چۆن خوا پشت و پەنای تۆیە، پشت و پەنای ئەهلی ئیمانە هەتا ڕۆژی قیامەت، هەرکەسێك لە بازنەی ئیمانی حەقدا بێت، خوای گەورە پشت و پەنای دەبێت، عیزەت و سەربەرزی و شکۆمەندی پێدەبەخشێت.

## کێ پێغەمبەری پاراست لە دوژمنەکەی؟

پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ صەحابەکان لە غەزایەکدا بوو، وەرزیش چلەی هاوین بوو، زۆر گەرما بوو، بیابانی عەرەبستانیش ڕووەکی هەیە، بەڵام ڕووەکێکی پەرش‌و بڵاو، هەر لە دووری سەد مەترەوە ڕووەکێك هەیە، دووسەد مەتر ڕووەکێکی تر هەیە، ئەوەندە وەختەکە گەرمابوو، مسوڵمانان لەخزمەت پێغەمبەردا ﷺ شەکەت و ماندووی ڕێگای دوور و مەیدانی غەزا بوون، پێویستیان بە سەرخەوێك و پشوودانێك هەبوو..

پێغەمبەری خوا فەرمووی بلآوەی لێبکەن، هەر یەك یەك و دوو دوو، بە پێی گەورەی و بچوکی درەختەکە، بچن لە شوێنێکدا ئیسراحەت بکەن. خۆی لەژێر درەختێکی بچکۆلەدا کە سێبەری بەسەرەوە دەکرد، چوو لەوێدا ڕاکشاو کەسی لەگەڵدا نەبوو دوورکەوتبووەوە. لەو کاتەدا کەچووبوە خەوەوە و بۆ ئەوەی سەرخەوێك بشکێنێت، کەسێك کە دیار بوو لەناو ئەو لەشکرە زۆرەدا خۆی مەلآس دابوو، پێغەمبەری خوا ﷺ بکوژێت، فرسەتی هێناو چووە سەر سەری بە هەردوو دەستی شمشێرەکەی بەرز کردبوەوە بۆ ئەوەی زۆر بەهێز لێی بدات..

شمشێرەکەی بەرز کردبوەوەو لە پڕێکدا هاواری کرد وتی: (**یا محمد مَنْ یَمْنَعُكَ مِني؟**) ئەی محمد ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە لێی دەگەڕام، کێ لەدەست من ڕزگارت دەکات؟ هیچ کەس ئاگای لێ نیە و دوور کەوتوویتەوە لەو هاوەڵانەی کە خۆت لەسەر بە کوشت دەدەن، هەر ئێستا گیانت لە لاشەت دەردێنم و کێ هەیە پێم بڵێ بتوانێت ڕزگارت بکات؟!

پێغەمبەر ﷺ بەم دەنگە ڕاپەڕی لە خەو، کە سەری بەرز کردەوە کابرا ئاوا شمشێرەکەی بەرز کردۆتەوەو ئامادەی پیاکێشانیەتی، دەفەرمووێت: زۆر بەهێمنی پەنجەی شایەتمانی بەرز کردەوەو فەرمووی: (الله) خوا من ڕزگار دەکات لە دەستی تۆ. –سبحان الله– دەڵێت لەو کاتەدا کابرا هەموو لەشی لەرزی، بە هەردوو دەستی شمشێرەکەی گرتبوو، شمشێر لە بەینی دەستیدا کەوتە خوارەوەو بۆ خۆی بەلادامات!

ئەوەندە لە ناخێکی پاکەوە فەرمووی (الله) خوا ڕزگارم دەکات، ئەو دوژمنە لەشی لەرزی، لەشی لەرزی و شمشێرەکە لە دەستی کەوتە خوارەوە، پێغەمبەر

ﷺ شمشێری کابرای هەڵگرتەوە، چونکە شمشێرەکەی خۆی بە لقی دارەکەوە هەڵواسیبوو، فەرمووی ئەی کێ ئێستا تۆ ڕزگار دەکات لە دەستی من؟!

کابرا بێ باوەڕ بوو، خوای نەدەناسی، –ئەوەی خوا نەناسێت پشت و پەنای نیە لەکاتی تەنگانەدا– لەو کاتەدا وتی هیچ شتێك لە دەستی تۆ ڕزگارم ناکات ئەی محمد، جگە مەردایەتیو پیاوەتی تۆ نەبێت، ئەگەر پیاوەتی بکەیت و مەردایەتی بنوێنیت ڕزگارم کەیت و نەمکوژیت، ئەوە لە پیاوەتی خۆتە، ئەگەر بشمکوژیت کەس نیە بەرگریم لێبکات و بەهاوارمەوە بێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ شمشێرەکەی خستەوە کێلانەکەی و فەرمووی ئەوە شمشێرەکەتو، بڕۆ من هەرگیز لە پێناوی خۆمدا ڕۆژێك نەچوومە مەیدانی خەڵکەوە، هەرگیز لە پێناوی بەرز بوونەوەی شکۆمەندی خۆمو سەروەتو سامانێك بۆ خۆمدا نەچووم بانگەوازی خەڵك بکەم، تۆ منت نەکوشت و مافێکیشم نیە لەسەرت، بڕۆ بەرێگەی خۆتدا با صەحابەکان پێت نەزانن. بڕۆ لە بەینی خۆتو خوادا تەوبەیەك بکەو بگەڕێوە بۆ لای خوا، ئەو خوایە بناسە کە منی لە دەستی تۆ ڕزگار کرد..

دەفەرموویێت کابرا دوورکەوتەوەو لە ناخی دڵەوە شایەتمانێکی بە حەقی بەخوا و پێغەمبەر ﷺ هێنا و وتی: ئەم دینە حەق و ڕاستە، پێغەمبەر ﷺ لەسەر خوا بە جواب بوو، بەڵام ئامادە نەبوو لە پێناوی خۆیدا تۆڵە لە هیچ کەسێك بکاتەوە، هەر خەڵکیشی تێنەگەیاند، خۆ ئەگەر سەرکردەیەکی دونیای ئەمڕۆ بوایە هەموو لەشکرەکەی لێ کۆدەکردەوە، خۆ پارچە پارچەیان دەکرد! دەیگوت هەوڵی تیرۆرکردنت داوە، لەڕووی یاساییەوە ویستوتە کارەکە ئەنجام بدەیت، لانی کەم بەندی هەتاهەتاییان دەکرد!

بەلأم پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بەسادەیی بەسەریدا تێپەڕی و کابرای ڕەوان کرد. بۆیە ئەم ڕەفتارە شیرینە، ئەم شەخسیەتە بەرزە، وای لەو پیاوە کرد کە ئیمان بێنێت، بە بێ ئەوەی کەس زۆری لێ بکات، ئەم ئیسلامە ئاوا بلأو بۆوە لە ماوەی بیست و سێ ساڵدا شەرق و غەربی گرت، هی حیکمەت و لێزانی و بەرەکەتی ئەم پێغەمبەرە بوو ﷺ.

کەواتە تۆی مسوڵمان لەمڕۆدا هەموو شتێکت بە هی الله بزانە، ئەگەر دەوڵەمەندیت خوا بەهۆی ئەو سەروەت و سامانەوە سەمعە و شەخسیەتیشی لەناو خەڵکدا پێبەخشیویت، خەڵك ڕێزت دەگرێت، چونکە دەسەلأتداری، دەوڵەمەندیت، هەتە، بوونت هەیە، خانووەکەت چەند قاتە، سەیارەکەت ئاخر مۆدە، لەو وەختەدا خوات لەبیر نەچێت، وەك قارون مەبە بڵێیت: ﴿إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِىٓ﴾ ئەمە هی خۆمە، ئەمە بە ئازایەتی و پیاوەتی و شەهامەت و زانستی خۆم ئەم پارە و سەروەت و سامانەم پێکەوە ناوە، هی شان و باڵ و لێکهاتوویو کارامەیی خۆمە، چونکە ئەگەر وات وت، ئەنجامت وەکو قاروون دەبێت: ﴿فَخَسَفۡنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلۡأَرۡضَ﴾ خۆی لەناو چوو، ماڵ و سەروەت و سامانەکەشی بە زەویدا ڕۆشتە خوارەوە، کەسایەتیت بە زەویدا دەڕواتە خوارەوە.



## ئەوەی بە ئاغایی نەیخوارد.. بە زەلیلی خواردی!

مەلای گەورەی کۆیە لە سورەتی حەجدا باسێك دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت:
کابرایەك هەبوو لە دەوروبەری نێوانی هەولێر و موصڵدا، دەسەڵاتێکی زۆر فراوانی هەبوو، زۆر لەخۆ ڕازی، هەموو خەڵك لێی دەترسان. ڕۆژێکیان ڕێی کەوتە کۆیە دەمەو ئێوارەیەکی درەنگ لای دابووە دراوسێیەکی نزیك ماڵی ئێمە، کە کۆنە ئاشنایان بوو، وەختی خۆی چەکدار بووە لەلای و ناسیاو بووە، ماڵەکەش هەژاربوون، ئەویش کۆمەڵێك خەڵکی لەگەڵە، ئەوەی کە خوا داویەتی نیسکێنەو ڕۆنێکیان دەبێت..

کابرا دەڵێت جەناب بە خوا دەستم بە هیچ ڕاناگا و خوا ئەمەندە نیسکێنە و ڕۆنەی داوە و نسیبی جەنابتی تێدا بووە، کە بۆی دادەنێن دەستێك لە قاپەکە دەدات و دەڵێت: لایبە.. دەبێ خوا نەمابێت، ئادەی بزانن خوا ماوە؟!!

وتیان: أستغفر الله، شتی وامەڵێ قوربان، عالی جەناب.. وتی: ئەگەر خوا بمایە دەیزانی کە من و نیسکێنە و ڕۆنیان نەگوتووە، من لەوەتەی هەم نازانم نیسکێنە و ڕۆن خواردن چیە، خواردنی من نیە.

—نعوذ بالله— ئەم ناماقوڵیە بە دەمیا هات، عیزەتی خۆی و شەخسیەتی خۆی لە دەوڵەمەندیەکەیدا، لە دەسەڵاتەکەیدا دەبینیەوە، دەیگوت من ئاوام، دەبێت خوا فەرقم بکات لەگەڵ خەڵکدا، نابێت ببینێت نیسکێنە و ڕۆن خواردنی من نیە، مەلای گەورە سوێند دەخوات دەفەرمووێت: ئەو پیاوەم بینیەوە سواڵی بەردەرگایانی دەکرد، مەمنونی پیاوێك بوو تۆزێك شۆربای نیسکی بۆ تێبکات، ئەوەندەشی خراپە کردبوو، کوشتیان کەس نەچووە سەر جەنازەکەی، بۆگەنی

کرد!   ئاوا ئینسان ئەگەر بێت و شەخسیەتی خۆت بە هی خوا نەزانیت، خوا زەلیلت دەکات.

## کەسایەتی بە شەهادە نیە

گەر کەسێك شەهادەیکی هەبو وەك پلەی ماجستێرو دکتۆراو بەرزتر.. نابێت ببێتە مایەی ئەوەی خۆی بەگەورەتر بزانیّ لە کەسانی تر  یان بڵێت شەخصیەتم بەرزترە.. ئەگەر شەخسیەتی تۆ بە شەهادەیەکە، ئەڵێی خاوەنی شەهادەیەکم، خوێندەواریەکی باشم هەیە، نابێت دەعیە و فیز بکەیت بەسەر نەخوێندەوارێکدا کە دەڵێت ئەو کاغەزەم بۆ بخوێنەوە، کە دەڵێت سەیرێکی ئەو موبایل و ڕەقەمەم بۆ بکە، دەبێت لەو کاتەدا بڵێیت: خوایە سوپاس بۆتۆ، ئەم زانستە هی تۆیە، ئەمە هی زیرەکی من نیە، ئەمە هی پیاوەتی و لێهاتووی من نیە، چونکە هەر ئەو شەهادەیەی کەتۆ هەڵتواسیوە و پێوەی دەنازی، ئەگەر خوا ئەو عەقڵەت لیّ بستێنێتەوە، بەس پارچە وەرەقەیەکە و هیچی تر، هیچ دەورێکی دەمێنێت؟! تۆ پرۆفیسۆر بە، ئەگەر عەقڵت لەدەست دا، دەبێت لەگەڵ منداڵان خەڵك لە کۆڵاندا یاریت پێدەکەن،پارچە کاغەزێکەو مەرەکەبێکی لەسەر وشك بۆتەوە، دەبێت زانستەکەت بەکاربهێنی بۆ خزمەتی خەڵکی.

لەشاری سلێمانی بەچاوی خۆم پیاوێکم بینی، هات و هاواری دەکرد و هەموو منداڵو گەنجو لاو لێی کۆبووبوونەوەو بەردیان تێدەگرتو بەردی بۆ هەڵدەدانەوە، پیاوێکی دوکاندار کە دۆست و ناسیاومە، وتی: مامۆستا ئەو پیاوە دەناسیت، وتم نەوەڵا خوای گەورە ڕەحم بە ئێمە بکات، کارێکی خراپ دەکەن ئەو خەڵکە وا

سەریان خستۆتە سەر، وتی: ئەوە مامۆستای زمانی ئینگلیزی بوو، ئاوا شێت بوو، بەکالۆریۆسی هەبوو لە زمانی ئینگلیزیدا! زمانی ئینگلیزیو کوردی وەکو یەك دەزانی! هاوینان دەرسی تایبەتی بە کوڕە بەرپرسو و دەوڵەمەندەکان دەوتەوە، بەیانیەکیان کە هەستا ئاوا کەوتە کۆڵانو خەڵك ئێستا گاڵتەی پێدەکات.

شەهادە دەورێك نابینێت، شەخسیەتی تۆ ئەگەر بە شەهادەکەتەوەیە، دەبێ بڵێیت: خوایە ئەمە هی تۆیە، هی واهەیە شەخسیەتی خۆی بە کوڕەکانیەوە هەڵدەکێشێت، بە کچەکانیەوە، دەڵێت هەموو کوڕ و کچەکانم شەهادەی بەرزیان هەیە، بڵێ: ﴿وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا﴾ طه: ١١٤. خوا بە پێغەمبەر دەفەرموێت: بڵێ خوایە عیلمم زیاد بکەیت، زانین بە خوایە، هی تۆ نیە، ئەوە خوا پێی بەخشیویت، وەکو تاقیکردنەوە بەهی خوای بزانە.

### کەسایەتی بە نەوە زۆری نیە!

هی واهەیە شەخسیەتی خۆی لە ئەولادا دەبینێتەوە، دەڵێ وەڵا ئەوەندە کوڕم هەیە، ئەوەندە خزم و عەشیرەتم هەیە، ئەوە لە کۆنەوە خوا لە قورئاندا تۆماری کردووە کاتێك کە کابرایەك شانازی بەسەر برادەرەکەیدا دەکرد، دوو کەس هاوڕێ بوون، یەکێکیان هەموو کاتێك پێی دەوت: قیامەت هەیە، لە خوا بترسە، ئەیوت: ﴿أَنَاْ أَكْثَرُ مِنكَ مَالاً وَأَعَزُّ نَفَرًا﴾ الكهف: ٣٤. قیامەتیش هەبێت فلان کەس، کە باسی خوا و قیامەت دەکەیت، لە قیامەتیشدا من لە تۆ باشترم، چونکە من ماڵم زۆرترە و ئەولادم زۆرترە، لە قیامەتیشدا ئەولادەکانم بەرگریم

لێدەکەن. خوا لە قورئاندا ئەوە تۆمار دەکات، وا مەبە چونکە ئەو کوڕانە دەبینی لەیەك حادیسەدا خوا دەتوانێت هەموویت لێوەرگرێتەوە، وەیان بیان کاتە مایەی سەرشۆڕی، چەند کەس هەیە فەقیرە، عەیبی نەبوو، ئەولاد سەرشۆڕی کرد بە کچو کوڕەوە شەخسیەتی نەهێشت، لەناو خەڵکدا، کە باشن، کە ڕێك و پێکن، هی خوایە (الله)ت لە بیربێت، ئەمانە هەموو تاقیکردنەوەی دونیاین، پێیان بوغرا مەبە..

•

## لەکاتی شکستیشدا خۆت بەلاواز مەزانە

لە جەنگی ئوحوددا پێغەمبەر ﷺ کاتێك فەرمانێکی شکێندرا و، بەو هۆیەوە حەفتا لە هاوەڵانی بەرزی کە گەورەیان ئیمامی حەمزە و، لیوا هەڵگر و ئاڵا هەڵگری ئیسلام موصعەبی کوڕی عومەیر شەهید بوون، لەگەڵ شەست و هەشت صەحابەی تردا، کە بە هەموویان حەفتا صەحابە شەهید بوون. پێغەمبەر ﷺ دوای شکستێك، کشانەوە دواوە، ئەبو سفیان کە سەرکردەی کافرەکان بوو لەو زەمەنەدا، سەرکردەی کوفری مەککە بوو لەو وەختەدا، چووە سەر بەردێکی گەورە، وتی: محمد لەناوتاندا ماوە؟!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (فَلا تُجِبْهُ) جوابی مەدەنەوە، هەر جوابیشی مەدەنەوە، کەس جوابی نەدایەوە، وتی: کوڕی ئەبی قوحافە، (ئەبو بەکر) ماوە لەناوتاندا؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: جوابی مەدەنەوە گوێشی مەدەنێ، هاواری کرد ئەی (عومەری کوڕی خطاب) ماوە؟!

هەر خۆی ئەبو سفیان وتی: دیارە هیچیان نەماون، شوکر ئەوانە بمانایە ئێستا دەنگیان دلێر دەبوو، دەنگیان بەرز دەبوو..

حەزرەتی عومەر خۆی پێڕانەگیراو وتی: بۆ ئەوەی خوا لوتی تۆی پێ بشکێنێت هەموویان ماون‌و سەلامەتن. ئەو کاتە ئەبو سوفیان هاواری کرد (أُعْلُ هُبَل) شکۆمەندی بۆ هوبەل، خوای جەنگ، -بەردێکیان پێبوو ناوی هوبەل بوو، دەیگوت ئەمە خوای جەنگە، لە جەنگدا ئەو پشتیوانیمان لێدەکات-.

• پێغەمبەر ﷺ لەم کاتەدا فەرمووی (أَجِبُوهُ) ئێستا جوابی بدەنەوە، -مادەم هاتە سەر بیر و باوەڕ، نابێت مسوڵمان بێدەنگ بێت-.

وتیان: بڵێین چی ئەی پێغەمبەری خوا؟! فەرمووی بڵێن: (اللهُ أَعْلى وَ أَجَل) خوا بەرز و شکۆمەندترە، ئەوە شکۆ بەدەست خوایە و جەنگ دۆڕان حیکمەتێکی لە پشتەوەیە، کە الله سەرپەرشتی دەکات.

ئەبوسفیان وتی: (لَنا العُزّى وَلا عُزّى لَكُمْ) ئێمە بتی عوزامان هەیە ئێوەی داماوی مسوڵمان بتی عوزاتان نیە و پشتان تێکردووە..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: جوابی بدەنەوە، وتیان: بڵێین چی؟ فەرمووی بڵێن: (اللهُ مَولانا وَلا مَولا لَكُمْ) خوا پشت و پەنای ئێمەیە و ئێوەی کافر پشت و پەناتان نیە، وەلاهی هەر کەسێك خوا نەناسێت پشت و پەنای نیە، خۆ ئەبو سفیان سەرکەوتبوو لە جەنگەکەدا، ئەبو سفیان بەحسابی خۆی تۆڵەی بەدری کردبوەوە، لەو کاتەدا پێغەمبەر فەرمووی (اللهُ مَولانا وَلا مَولا لَكُمْ) ئێمە لە مەیدانی جەنگیشدا تێك بشکێین، حەفتا صەحابەشمان شەهید بێت، هەر براوەین، چونکە خوامان لەگەڵە، بەس ئێوە هەرچەند سەرکەوتووبن، هەرچەند

شكۆدارین، به حیسابی خۆتان، هەر بێ پشت و پەنان، چونکه خواتان لەگەڵدا نیه.

تۆی مسوڵمان قەت خۆت به زەلیل مەزانه، قەت خۆت به بێ شەخسیەت مەزانه، وه شەخسیەتیش دەرەجەی هەیه، پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاریمان دەکات و دەفەرمووێت: (لا يَنْبَغِ للمؤمنِ انْ يُذِلَّ نَفْسَهُ) ئیماندار نابێت نەفسی خۆی زەلیل بکات، وتیان پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن مسوڵمان زەلیل دەبێت؟

فەرمووی (يَتَعَرَّضُ مِنَ البَلاءِ لِما لا يُطيقُ) خۆی دەخاته ناو بەحرێکەوه، گێژاوێکەوه، قسەیەکەوه، که پێی هەڵناگیرێت، که سووکی دەکات، خوا تۆی سووك نەکردووه، خوا هەموو کەسێکی ڕێزدار کردووه، دەبێت وریای خۆت بیت، خۆت سووك نەکەیت، جا هی واهەیه گەر شەخسیەت صەد پله بێت، سەد دەرەجەکەی هەمووی ڕۆشتووه، شەخسیەتی نەماوه.. هی واهەیه نەوەدی ماوه، هەیه هەشتای ماوه، کەس نیه بێ کەم و کوڕی بێت، هەوڵ بده لەو شتانه دوور بکەوەرەوه که شەخسیەتت دادەبەزێنن.



## ئەو هۆكارانەی كەسایەتیت دادەڕوخێنن:

### یەكەم: خۆ هەڵقورتاندن لە ئیشی خەڵك

یەكێك لەوانە زۆر پرسیار كردن كە بەداخەوە هی واهەیە دەچێتە ماڵێك، میوانیەك دەكات، برادەرێكی هەیە، لە هەموو شتێك دەپرسێت، ئەم خانووەت بە چەند كڕی، ئەمەت چۆن كڕی، بەچەند كڕیت؟ چۆنی دەفرۆشی؟ موچەكەت چەندە؟ كابرا معاشی هەیە پێویست ناكات من و تۆ لێی بپرسین موچەت چەندە؟ خۆی ئەگەر پێویست بێت بۆت باسدەكات و كە پێویستیش نیە بۆت باسبكات، كابرا لە سەفەرێكە پێویست ناكات بڵێی فلان كەس لەكوێ بوویت، دیار نەبوویت، چیت كرد، بۆ كوێ چوویت؟

میوانی هات دراوسێكەی لێی بپرسێت: ئەو میوانە كێ بوو؟ بۆچی هات؟ ئەوە كچەكەت چوو بۆ كوێ، ئەوە كوڕەكەت لەكوێ وەرگیرا؟ ئەمانە زەرور نین، وایان لێدێت خەڵك لێت بێزار دەبێت، بەو هەموو پرسیارانە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (**مِنْ حُسْنِ الإِسْلامِ المَرْءُ تَرْكُهُ ما لا يَعْنِه**) جوانترین سیمای ئینسانی مسوڵمان ئەوەیە، قسە و پرسیار لە شتێك ناكات كە پەیوەندی بەوەوە نەبێت، سەمعەی خۆی ناشكێنێت لە هەموو شتێك بپرسێت، چونكە خەڵك وای لێدێت خۆی لێت دەپارێزێت، جا تو خوا حەیف نیە لەپێناوی شتێكی هیچدا ئینسان سەمعەی خۆی سووك بكات لەناو خەڵكدا.

ئەڵێن پیاوێك برادەری پیاوێك بوو، بیست ساڵی پێ چوو لەیەك جیابوونەوە، ئەو لە شوێنێك و ئەم لە شوێنێك، ڕۆژێك تووشی یەك بوونەوە، كابرای یەكەمیان كاتی خۆی مەڕدارێكی ئەستور بوو، مەڕدارێكی ئەستەم، زۆری مەڕ و ماڵات

هەبوو، کابرای برادەری زۆری پرسیار لێکرد، ژنەکەت چۆنە و منداڵت چۆنە و کوڕت چۆنە، وتی ئەی مەڕەکانت چۆنن؟ وتی: وەڵاهی لە دێر زەمانەوە مەڕەکانم نەماون، دەمێکە مەڕداری ناکەم، وتی ئەی تو خوا بەرخەکان چۆنن؟!! کابرا وتی: دە کاکە هەر بۆ خۆت بڵێ، من دەڵێم مەڕم نەماوە، ئەگەر مەڕم نەبێت بەرخم لەکوێ بوو!!

هی واهەیە وایە، تۆ دەڵێی ئەوەم نیە، ئەو لە شتی کە لێت دەپرسێت، کەواتە بڵێی کاکە بۆ خۆت هەر پرسیار بکە، من وەڕەس بووم لەدەستت، لەبەرئەوە ئینسان شەخسیەتی دادەبەزێت بەو هەموو جۆرە پرسیارە، ئەوە هەمانە لە ژن و لە پیاو، ئەبێ ئاگامان لە خۆمان بێت.

## دووەم: دەم تەڕی کاسە وشك

لەم زەمانەی ئێمەدا بەرپرسەکان بۆچی سووك بوون؟ دەچێتە هەر شوێنێك کۆمەڵێك وەعد فڕێ دەدات، خۆ هەر خەڵك هێشتا قسەکەی نەکردووە دەڵێت بڕوای پێمەکە، بەخوا درۆ ئەکات، ئەگەر بیشیکات چونکە هێندەی درۆ کردووە، هەر دەمی تەڕە و کاسەی وشکە، خەڵك لێی بێزار بووە، دەبێ ئینسان دەرس لەوانە وەربگرێت. مەڵێ بەسەر چاو، بڵێ بۆم ناکرێت، بەخوا باوەڕناکەم بتوانم بێم، مەگەر خوای گەورە یارمەتیم بدات. ئەگەر بەسەرچاوت کرد دەبێ بیکەیت. هی واهەیە کە تووشی زەلامێك دەبێت لە باوكو باپیرو کەس‌و کاریەوە لێی دەپرسێت، کەچی بۆ پارەیەکی کەم موحتاج بێت نایداتێ! دە ئەوەشیان مەکەو بەڵام لەمەیانا لەگەڵی بە، ئەو دەم تەڕی کاسە وشکە ئینسان سووك دەکات.

## سێهەم: شت خواردن بەبێ ڕەزامەندی خاوەنەکەی

شت خواردن لە دوکانێکدا، کابرا دوکانی میوەی هەیە، وەرزی میوەجاتە، پێدەگات، ترێیەکە، قۆخێکە، قەیسیەکە، سەیر دەکەیت کیلۆیەکی کێشاوە، هەیە نەیشی کێشاوە، دانەیەك دەخاتە دەمیەوە، کابرای دوکاندار پێی عەیبە پێت بڵێت، بەڵام پێی ناخۆشە لەناخی خۆیدا، حەزدەکات شتی لێنەکڕیت، خۆ بەوە هیچ ڕونادات، کەچی لەبەر چاوی سووك دەبیت.

هەیە دوکانی چەرەساتێکە، دەستێکی پێدا دەکات، سێ چوار دانە فستەق و هێندێك گوڵەبەڕۆژە هەڵدەگرێت! ئەمانە زۆر خراپن، ئەوە وات لێدێت خەڵك لێت بێزار دەبن، هەر کە چاوی پێت کەوت لێت دەترسێت، دەڵێت فلاَن کەس دێت. هەیە هیچ عەیبی نیە لەم کۆمەڵگای ئێمەدا، بە چاوی سووك سەیر دەکرێت، خەڵك خراپ باسی دەکەن، هیچ خراپەیەکی نیە ئەوە نەبێت کیلۆیەك تەماتە دەکێشێت، کابرا کە کێشای دانەیەکی زیادەی تێدەکات، وەڵاهی بەو دانە تەماتەیە، بەو دەنکە قۆخ و قەیسیە، نە لەبرسان دەمریت، نە دەوڵەمەند دەبیت، نە فەقیر دەبیت، بەس شەخسیەتت پێی دادەبەزێت. لەبەرئەوە بیکڕەو لەوێش مەیخۆ، لەو بازاڕە ئەو نەفسەت بگرە، وەرەوە ماڵێ و جوان بیشۆ و ئەمجا بە ئیسراحەت لەماڵی خۆت بخۆ، هەمووی هی خۆتە.

ڕۆژنامەیەکم خوێندەوە باسی ئەوە دەکات لە ئەمریکا ئافرەتێك ناوی (ئۆرکۆیە) تەمەنی هەشتا و شەش ساڵە، تا ئێستا سەد و شەست جار لە دزیدا گیراوە، حکومەت بڕیاری دا پێناسەیەکی بدەنێ، بچێتە هەر سۆپەرمارکێتێك کە پێناسەکەیان نیشاندا، هەموو کامێرەکانی بخەنە سەر نەوەکو دزی بکات، لێیان

پرسی: بەهۆی چیەوە توشی دزی بوویت؟!

وتی: سەرەتا لەوەوە دەچوومە هەر شوێنێك دەستم بە گوڵە بەڕۆژە و شتی وادا دەکرد لە چەرەسات و شتی وادا، دوای وام لێهات کابرا مەشغوڵ دەبوو ئەمجا مستەکەم گەورە دەکرد، دوایی بە کیلۆ دەمدزی! دواتر وای لێهات سەد و شەست جار لە لایەن حکومەتەوە لەسەر دزی گیراوە، پێی تەرك ناکرێت، لەبەرئەوە هەوڵبدە شەخسیەتت با نەڕوخێت، بە شتێکی زۆر بچوکی زۆر سادە، کە نە دەوڵەمەندت دەکات و نە فەقیر، بەڵام خەڵکی ئازار دەدەیت.

## چوارەم: ئیش و کار پۆخڵی

هەر ئیشێکت هەبوو، دوو شتی تێدا ڕەچاو بکە: وا بەدڵ و بە گیان ئەوەی هەیە لەسەری بیکە، کە ئیشەکە تەواو بوو کابرا چووە خانووەکەوە، چووە ئیشەکەوە، بڵێ یارەبی ڕەحمەت لە دایك و باوکت ئیسراحەتم لە دەستی کرد، دووەم: موشتەریت بۆ پەیدا دەکات، نەك ئەگەر کابرایەکیش وتی بە تەمای فلان وەستام، بڵێ ئامان خۆتی لێ بپارێزە، ماڵی منی وێران کردووە، ئەوە پێی سووك دەبیت، با سەمعەت بە خراپی نەڕوات.

## پێنجەم: بە دەنگی بەرز قسەکردن

کەسی واهەیە مەرحەبایت بکات، گەڕەکێك دەزانێت، ئەوە زۆر خراپە، ئەوەندە وا قسەکە بکە بەرامبەرەکەت گوێی لێبێتو گوێی لێنەبێت، بەسە پێویست ناکات ئەوەندە دەنگت بەرز بێت، ژن بێت یان پیاو بێت کە گەڕەکێك

پێت بزانێت کە مەرحەبایی فلان کەسی کردووە، کە قسەیەکی گێڕاوەتەوە، خوا لە قورئاندا دەفەرموویێت: ﴿إِنَّ أَنكَرَ ٱلۡأَصۡوَٰتِ لَصَوۡتُ ٱلۡحَمِيرِ﴾ ناخۆشترین دەنگ کە خوای گەورە بەخراپی داناوە دەنگی گوێ درێژە کاتێك پێکەوە دەزەڕێنن، لەبەر خراپی گوێ درێژ؟! نا، لەبەر دەنگی بەرز. دەفەرموویێت تۆ وامەبە، تۆ مرۆڤیت، پێوستە قسەکانت هێمن و لەسەر خۆبن، خۆ لەسەر موزیعی ئیزاعەیەك نیت قسە بکەیت بە دەنگێکی حەماسی بیخوێنیتەوە.

## شەشەم: دانیشتن و وەستانی بەردەرگا

بەتایبەتی دانیشتنی ئافرەت لەبەر دەرگا بەبێ ئیش، کە نیشانەی سووك بوونیەتی، واتە ئەم ئافرەتە نە دەست ڕەنگینە، نە خان و مانی ماڵە، نەبە هیچەوە خەریکە، تۆ وەرە لەم سەردەمی زانست و پێشکەوتنی ئەمڕۆدا، نە خەریکی دونیا بیت، نە خەریکی قیامەت بیت، هی واهەیە لە بەیانیەوە مەگەر سێبەر نەبێت لێی دابنیشێت، هەتا ئێوارە موراقیبی سەرجادەیە، کەواتە کچی ئەو ماڵەشت نەوێت، چونکە ئەوە نیشانەی سووکیەتی ئەو ماڵەیە کە هەموو ئافرەتەکانی لەبەردەرگا بێت، بێکار و بێ ئیش دابنیشن.

## حەوتەم: سەردانی کردنی زۆر لەڕادە بەدەر

برای خۆت بێت هەموو ڕۆژێ و هەموو شەوێك لەماڵی بوویت سووك دەبیت، جا هی واهەیە هەموو ڕۆژێك دەچێتە ماڵی فلان کەس، هەموو دەمێك تەلەفونی هەیە، هەموو ڕۆژێك دەچێتە لای فلان بەرپرسو دائیرە، هی واهەیە کابرایەکی خراپ

نیه، زەرەری بۆ حکومەتیش نیە، هەموو بەرپرسان دەترسن دەڵێن بەخوا فلاّن کەس بوو، ئەوە خۆ کاکە هەموو ڕۆژێك دێتە سەرمان! قەت وامەبە، برا دەریشت بوو ساڵی جارێك ئەگەر پێویستی کرد مەرحەبایی بکە، وامەبە ئەوەندە سەردانی بکەیت سووك بیت، بە حیمایەکەی بڵێت کاکە مەیکەنە ژورێ، فلاّن کەسە لێی وەڕەس بووم.

پێغەمبەر ﷺ دەرمانی ئەوەشی داناوە، دەفەرموێت: (زُرْ غِباً تَزدِدْ حُباً) کەم کەم دیدەنی و سەردانی یەك بکەن، لای یەك خۆشەویست دەبن، با سەمعەت دانەبەزێت، ئەها دینەکەمان هەموو شتێکی تێدایە، با سەمعەت دانەبەزێت، خەڵك لێت وەڕەس نەبێت. جا ئەم شەخسیەتە لەتاکدا هەیە، لە خێزانیشدا هەیە. هی وامەیە بنەماڵەکەی بەداخەوە سەمعەی ڕووشاوە، هی وامەیە کچەکەی ڕێك و پێکە، خەڵك بەهۆی بنەماڵەکەیەوە نایەوێت، دەڵێ کچی بنەماڵەی فلاّن کەسە! هی وامەیە کوڕێکی ڕێك و پێکی بێ عەیبە، خەڵك کچی ناداتێ دەڵێ لە بنەماڵەی فلاّن کەسە، خۆی لێدەپارێزێت.

سەمعە لە هەموو شتێك کاریگەرترە کە پێتەوە لکا، ئەگەر بەباشەوە پێتەوە لکا زۆر باشە، ئەگەر بە خراپ پێتەوە لکا وەك موگناتیس وایە لێت نابێتەوە، جا هی وامەیە بنەماڵەکەشی تێدا دەچێت بەهۆی ئەوەوە، سەمعەی شوێنی لەدایك بوونت دێیەکەی لەدایك بوونت. دێی وامەیە سەمعەی خراپ ڕۆشتووە، دێی وامەیە کە وتت دێی فلاّن کەس، دەڵێت ئا بەخوا هەموویان شەڕانین، پیاو کوژەکان، فیتنەچیەکان، ناکۆکەکانی بەینی خۆیان! ڕقیان لەیەکە. بێ دینەکان، دێی وامەیە بە بێ دینی ناوی دەرکردووە، بچۆ بۆ مزگەوت نوێژێکی تیدا ناکرێت، پیس و پۆخڵەکان، ئەو دێیەی هەموو کۆلاّنەکانی زبڵە، هەر خەڵك یەکسەر کە وتت

فلآن دێ وێنەی ئەوە دەكات لەبەر چاوی ئەو دێیەی زۆر پیس و پۆخڵە. ئەو دێیەی كە زۆر ڕەزیلن، میوانێك نابەنەوە..

بەڵام ئەی چەند خۆشە سەمعەی دێیەكەت بەرز بێت، وەك ئەوەی ڕێكخراوی یونیسێفی جیهانی ڕاپۆرتێكی نوسیوە لە ئامارەكەیدا، نوسیویەتی دەڵێت: پاك و خاوێنترین دێ لەسەر كورەی زەویدا دێیەكی كوردستانی ئێرانە، دێی (كۆسەی هەجیج) لەناوچەی پاوە. هەموو دونیا گەڕاون، هەرچی لادێ هەیە لەو لادێیە پاك و خاوێنتری تێدا نیە! ئەوە چەند خۆشە، چەند سەربەرزیە بۆ میللەتی كورد، ئەڵێ پاك و خاوێنترینە لە ڕووی ژینگەوە، لەڕووی ئەوەوە زبڵێك لەناو ئەو لادێیەدا نابینیت، مالآتی هەیە، هەموو ماڵێك كەسی ئامادەنیە سەللە زبڵێك بڕێژێتە سەر كۆلآنێك، سەیارەی بۆ دەگرێت، دەیبات لەناو موڵكێكدا ڕۆی دەكات، هەم سودی لێوەردەگرێت، هەم نابێت زبڵو پیسیو مێشوولەو حەشەراتی پیس بلآوبێتەوە.

ئەمەیان هەموو كردووە بە ڕاپۆرت، لەم دێیەدا دەڵێت یەك جگەرە كێشی تێدا نیە، بۆ ئەوەی دوكەڵ ژینگە پیس نەكات، كەسێك نیە لەو دێیەدا لەگەورە و بچوك جگەرە بخوات، دێیەك نوێژنەكەرێكی تێدا نیە، كە ئەوە بەڕاستی جێگای فەخرە لە دێیەكدا لە منداڵەوە تا گەورە نوێژنەكەرێكی تێدا نەبێت، ئەمانەیان هەموو كردووە بە ئامار، لە دێیەكدا یەك كەسی نەخوێندەواری تێدا نیە، كەسێك نیە نەخوێندەوار بێت، پێویستی بەوە بێت نامەیەكی بۆ بخوێنیەوە، مۆبایلێكی بۆ تەماشا بكەیت.



## وڵاتانیش شەخصیەتو شکۆیان جیاوازە

وەك پەندێکی کوردی هەیەدەڵێ: (خویەك گرتت بە شیری، تەرکی ناکەی بە پیری) ئەلێم: ئەگەر خویەك گرتت بە شیری، تەرکی نەکەی بە ژیری، لەگەڵتدایە تا پیری! ئەبێ ژیر بیت، بە لێزانانە لە خۆتی بکەیەوە.

هەندێ جار سەمعە لەسەر ئاستی وڵاتدا ناشیرین دەبێت، ئێستا عێراق لە زەمانی ئیمامی حوسێنەوە کە تیایدا شەهید کراوە، وتویانە: (**أهلُ العراق أهْلُ النفاق**)، ئەم عێراقە هەر ناوی بە ئەهلی دووبەرەکیو یەکتر لەناوبردن ڕۆشتووە، لە زەمەنی مەلیکەوە سەیری بکە، یەك حاکمێك لەم وڵاتی عێراقەدا بە بێ ئینقیلابی عەسکەری نەبێت نەڕۆشتووە، وەرە یەك یەك لە عبدالکریم قاسم و عبدالرحمن عارف.. حاکمێك نیە بە زەبری گولە و کوشتن نەبێت لەسەر کورسیەکە چۆڵی کردبێت نیە، هەتا صەدام حسێنو ئەگەر ئێستاش وای لێنەیەت، ئەمان بۆ خۆیان بڕۆن.. عێراق وای لێهاتووە لە گەندەڵیدا یەکەم وڵاتە لە وڵاتانی هەمووکەنداوی عەرەبدا. لە ئاستی هەموو جیهانیشدا عێراق سێیەم وڵاتی گەندەڵی دونیایە.

## بە گەندەڵیەکی بچوك پارێزگارێکی سوید دەرکرا

لە وڵاتێکی وەکو (سوید)دا سەمعەی بەپاکی ڕۆشتووە، سەمعەی بەڕێزەوە ڕۆیشتووە.. پارێزگاری ستۆکهۆڵم، دوای ئەوەی کە لە نزیك عەسرانێکدا کە دەوام نەماوە لە ماڵی خۆیایەتی، بە سەیارە تایبەتیەکەی خۆی، کە نە پاسەوانی تایبەتی لەگەڵدایە نەهیچ، پارێزگاری شارێکە سەرۆکی حیزبێکی گەورەشە، کە لە

پەرلەماندا دەنگی هێناوە و ئەمیان کردووە بە پارێزگار، چۆتە بەنزین خانەیەك، کە دەستی بە گیرفانیدا کردووە دیارە پارەی تەواوی پێنەبووە، کارتەکەی دەرهێناوە، هەویەکەی دەرهێناوە، بە کابرای بەنزین خانەی وتووە من پارێزگاری ئەم شارەم، یەعنی ئەوەندە ناسراو نەبووە، کابراش بیناسێت! وتوویەتی ئەوە هەویەکەمە پارێزگارمو ئەو بەنزینەم بۆ تێبکە..

کابراش لەبەرئەوەی کە ئەم پارێزگارەو هەویەکەی نیشانداوە قسەی نەکردووە، بەڵام دواتر هەموو دونیای لێ تێگەیاند، هەموو وڵاتی سوید، ڕۆژنامەنووس، دەزگا و تیڤی و ڕاگەیاندنەکان..

وتی ئەو پیاوە بە هەویەی پارێزگاری دەستدرێژی لەمن کردووە. نیشانی داوم کە من پارێزگارم و بەنزینم بۆ تێبکە.. خۆ هیچیشی پێنەوتووەو، سەرەکەشی نەبڕیوە وەکو ئێرە، هەموو سویدی لێهاتە دەنگ، وتیان ئەم پیاوە بە کەڵکی کاربەدەستی نایەت، چونکە سودی لە پۆستی حکومی کردووە لە غەیری دەوامدا، هەویەکەی نیشان داوە.. کابرا بە ناچاری هاتە سەر کەناڵی تەلەفزیۆنو وتی داوای لێبوردن لە میللەت دەکەم و، ئیستیقالە لە پۆستەکەم دەکەم و دەڕۆمەوە ماڵی خۆم.

ناچاریان کرد دەست لەکار بکێشێتەوە، بۆ ئەوەی خەڵکی دیکەش فێرنەبێت پۆستی حکومی و پۆستەکەی بەکار بهێنێت لە تێکردنی بەنزینێکدا، دراش بە دادگا دوایش هەر لەکۆڵی نەبوونەوە لەبەر دەمی دادوەردا وتی جەنابی حاکم پارەی تەواوم پێنەبوو چەند پارەیەکی کەمم پێبوو، حاکم وتی ئەو قسەیە هیچ نرخێکی نیە، چونکە دەتوانی سەیارەکەت بەجێ بهێڵیت، خۆ شار هیچ مەترسی

لەسەر نیە، سەیارەکەت بەجێبهێشتایە و بەو پارەکەمە سواری پاسی گشتی ببویتایە و بچویتایەتەوە بۆماڵەکەی خۆت، پارەت بهێنایە..

نابێت سەرسام بین بەمەش چونکە ئەوە یاسای ئیسلامە، ئەوە پێنجسەد بۆ شەشسەد ساڵ لەمەوبەر فەیلەسوف و گەورە بیرمەندی ئیسلام، (ئیبن خەلدون) لە کتێبی (المُقَدِمة) ئەڵێت: (ئاگاتان لێی بێت لەهەر وڵاتێکدا کاربەدەست و دەسەڵاتدار و سیاسەت مەداران پۆستی حکومیان بەکارهێنا بۆ بەرژەوەندی شەخسی خۆیان، ئەو وڵاتە کاول دەبێت).

ئەو وڵاتەی ئەوروپا ئەو قسەیەی ئیبن خەلدونی فەیلەسوفی ئیسلام بەکار دێنێت بۆ ئەوەی وڵاتەکە کاول نەبێت.

کوردیش سەمعەیەکی باشی هەیە وەکو میللەتێك بەخشندەیە، بەبەزەییە، بە رەحمە بەرامبەر ئەو کەسانەی لەناویدان، ئەو هەموو عەرەبە خەڵك لێرە ڕێزیان لێدەگرێت، ئەگەر ئەو بوایە ڕەنگە بۆ تۆ وانەبوایە، ئازایە، دڵسۆزە، وەفادارە، ئیسلام دۆستە و وڵاتی جوانە، پڕ بەرەکەتە.. کەچی بەداخەوە سەمعەی وا ڕۆشتووە: (لەناو خۆیدا خۆ خۆرە) هەمووی رِقی لەیەکترە، حەسودە بەرامبەر بەیەك، نەیارە بەرامبەر بەیەك!

چەند جوانی فەرمووە زانایەك وەصفی کورد بەوە دەکاتو دەڵێت: (تا نەخۆش نەکەویت کەس گوڵت بۆ ناهێنێت). ئێ خۆ من گوڵم بە نەخۆشی بۆ چیە، بەساغی پێت خۆشە گوڵ بۆن بکەیت، کە پێی خۆشە زەلیلی سەر جێگە ببیت ئەمجا چەپکێك گوڵت بۆ بێنێت..

تا نەگریەی فرمێسك نەڕێژیت، کەس دڵخۆشت ناکات..

تا هاوار نەکەیت کەس ئاوڕت لێناداتەوە..

تا نیازی ڕۆشتن و بارکردنت نەبێت کەس سەردانت ناکات..

تا نەمریت کەس ناڵێت پیاوی چاك بوو گەردنی ئازاد بێت..

یەکێکی کە دەڵێت: (ئێمە ئاواین بۆ عەیبی دوژمن بە دووربین دەڕوانین، بۆ عەیبی یەکتر بە ورد بین دەڕوانین)!!





# بەشی سێهەم

# کەسایەتی نەفس بەرز و

# خاوەن هەڵوێست

## خاڵە بنەڕەتیەکانی ئەم بەشە:

❁ قالَ اللهُ تَعالى: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝ وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ۝﴾ الشَّمْس: ٩ ـ ١٠.

❁ وَ قالَ اللهُ تَعالى: ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَا يَعۡلَمُونَ ۝﴾ المُنافِقون: ٨.

۞ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (لَوْ أَنَّ لابْنِ آدَمَ مِلْءَ وادٍ مالاً، لَأَحَبَّ أَنَّ لَهُ مِثْلَهُ، وَلا يَمْلَأُ عَيْنَ ابْنِ آدَمَ إلا التُّرابُ، وَ يَتُوبُ اللهُ عَلى مَنْ تابَ) رَواهُ البُخاري: (٦٤٣٧) وَ مُسْلِم: (١٠٤٩).

۞ وَ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (ماذِئْبانِ جائِعانِ أُرْسِلا في غَنَمٍ بِأَفْسَدَ لَها مِنْ حِرْصِ المَرْءِ عَلى المالِ وَ الشَّرَفِ لِدِينِه). رَواهُ الترمذي: (٢٣٧٦) وقالَ حَسَنٌ صَحيحٌ.

۞ وَ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (يَهْرَمُ إِبْنُ آدَمَ وَ تَشِبُّ اثْنَتانِ: الحِرْصُ عَلى المالِ وَ الحِرْصُ عَلى العُمُرِ). رَواهُ البُخاريُّ: (٦٤٢١) وَ مُسْلِم: (١٠٤٧).

## سەرچاوەکان:

١) قورئانی پیرۆز.

٢) نَظْرَة النَّعيم، ج١٠، ص٤٨٥٢.

٣) گۆڤاری بڕیار، ژ: ٣٦، لە مانگی ئایاری ٢٠١١، ل٢١.

٤) المجموعَة الثانِيَة مِنْ صَحيح وَصايا الرَّسُول ﷺ سَعْد يوسف أبو عَزيز، ج٢، ص٢١٠.

٥) زنجیرەی بەختەوەری (ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە)، حاجی کاروان، ل٣٥.

٦) تەفسیری کوردی، مەلای گەورەی کۆیە، ب١٠، ل١٢٢.

٧) لە خزمەت قورئاندا، ئەندازیار عثمان، ل٢٩٩.

٨) تریفەی مانگ. م. غریب پێنجوێنی، ل ٥٣.



باسی پاراستنی کەسایەتی و شەخسیەتی ئینسان، کە لە ڕۆژگارێکی وەکو ئەمڕۆدا زۆر پێویستە، ئینسان بە تایبەت خەڵکی مسوڵمان‌و دیندار ئاگاداری ئەوە بێت. ئەم مەوج و شەپۆلە دونیا ویستیەی کە ڕووی کردۆتە خەڵکی، کاریگەری نەبێت لەسەر شەخسیەت و لەسەر کەسایەتی دونیایی و دوا ڕۆژیمان.

ئینسان بیر لەچی بکاتەوە سەرەنجام کەسیەتی لەو بیرکردنەوەی خۆیدا دەردەکەوێت، ڕۆژانە تۆ سەیری خۆت کە بەردەوام بیر لەچی دەکەیتەوە؟ بیر و هۆش و مێشکت زۆرتر بەچیەوە مەشغوڵە، ئەو کاتە ئەوەی کە لە مێشکتدایە دێتە سەر زوبانیشت، ئەبێتە قسە، زۆر بیر لە هەرشتێك بکەیتەوە زبانت ئەو قسەیەی بەسەر دەمدا دێت..

هەر قسەیەك زۆر کردت ئەبێتە ڕەفتار و کردار، بیرکردنەوەکە دەبێتە قسە، قسەکە دەبێتە کردار و ڕەفتار، ڕۆژانە ئەنجا بە کردەوە جێبەجێی دەکەیت. پاشان ئەو ڕەفتارە کە زۆر دووبارەی دەکەیتەوە تەمسیلی کەسێتی و شەخسیەتی تۆ دەکات.

لەبەرئەوە ئاگامان لێبێت هەموو کەسایەتیەك، بناغەکەی بیرکردنەوەی ژیانی ڕۆژانەتە، ئەگەر بیرکردنەوەیەکی دروست و سەلامەت و پاك و بێگەرد لە مێشکتدا بێت، سەرەنجام قسەی جوان دەکەیت، ڕەفتاری جوان دەنوێنیت، شەخسیەتی پاك و خاوێنت دەبێت لەناو خەڵکدا. ئەگەر بەردەوام بیرت لە لای خراپە بێت، ئەوەی کە لە مێشکتدا بێت خراپە بێت، هەر پیلان دژی خەڵك و ناحەزی بێت.. ڕق وقین ودوور لە دینی بێت، قسەکەشت هەر هەمان شتە.

## بیرت لای چی بوو لەسەر زمانیشتە !

دەگێڕنەوە دەڵێن: سیاسەت مەدارێك، ئەوەی کە حەزی لەبواری سیاسەتە، لەگەڵ کابرایەکدا لە مەجلیسێکدا دانیشتبوون کە خەریکی خانوو بوو، بێ خانووی تەنگی پێ هەڵچنیبوو، بیری لەخانوو دروست کردن دەکردەوە. کابرایەکی تریش فەلاح بوو، تۆکی هەبوو، تۆکی ساڵێکی کەوتبوەوە، بەتەمابوو گران بێ و بیفرۆشێت، لە مەجلیسێکی قەرەباڵغدا دانیشتبوون..

کابرای سیاسی ئەوەی کە بە فکری سیاسیەوە خەریکە وتی: وەڵاهی ئەم باروتۆخە وای لێکردووین هەموومان تووشی شۆك بووین، تووشی شۆك و سەرسوڕمان بووین، نازانین ئاڕاستەکەی بەرەو کوێ دەڕوات، بیری لە سیاسەت دەکردەوە..

ئەوەی تریان کە هەر بیری لای خانوو بوو مێشکی پڕبوو لە خانوو چۆن دەکرێت و چی دەوێت، وتی: جەناب فەرموت بلۆك چی لێهاتووە؟!

وتی بابە من دەڵێم تووشی شۆك بووین، من ناڵێم بلۆك، چونکە ئەو لای خانووبوو هەر بیری لای ئەوە بوو بلۆك گران بووە، چی لێهاتووە؟

ئەوی لەولاترەوە، کابرای فەلاحیش وتی: دەڵێن تۆك گران بووە؟!

وتیان: بابە دیسان باسی تۆکیش نیە، جا ئەوەی لە مێشکتدا بێت، قسەکانی زوبانیشت بەزۆری ئەوە دەبێت، وە ئەو ڕەفتارە پاشان کەسایەتیت لەسەر ئەوە دەنوێنێت.

## دەروونی بەرز کەسایەتی بەرز دروست دەکات

گرنگە ئینسان لەبیرکردنەوەی خۆیەوە دەست پێ بکات، کە کاتێك بیری خراپت بۆ هات، پەنا بگریت بەخوا و واز لەو بیرە خراپە بهێنیت، شەخسیەتی ئینسان لەسەر دەرونی بەرزەوە دروست دەبێت، لەسەر عیزەتی نەفسەوە دروست دەبێت، ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۞ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ۞﴾ الشمس: ٩ - ١٠. قورئان دەفەرمووێت: بەڕاستی ئەو کەسانە سەرفرازن کە تەزکیەی نەفسی خۆیان کردووە، کە عیزەتی نەفسیان هەیە، عیزەتی نەفس مانای تەکەبور نیە، مانای ئەوەنیە سەلام لە خەڵك نەکەیت، خۆت پێ لە هەموو خەڵکی گەورەتربێت، یان خەڵکت پێ مێروله بێت و خۆتت پێ فیل بێت، خەڵك لە ناخی زەویدا ببینیت، خۆت لە ئاسمان! ئەوە کیبرە، ئەوە نەهی لێکراوە.

عیزەتی نەفس ئەوەیە: خۆت پێ لەخەڵکی، ڕەنگە پێ خراپتر بێت باشتر نەبێت، سەلام لە هەموو خەڵك دەکەیت کار و کردەوەکانی خۆت زۆر پێ بچوکترن لە لای خوا لە کار و کردەوەی خەڵك، دەڵێی زۆر خەڵکی لەوانەیە لە من باشتر بێت، ئەوەی کە چاکیشم ئەوە هەموو فەزڵی خوایە، تەکەبور لە دڵ و دەرونتدا نیە. بەڵام عیزەتی نەفست ئەوەیە: هەر شتێك شەخسیەتت لەناو بەرێت نایکەیت، کار و پیشەیەك، هات و چۆی شوێنێك، هاورێیەتی کەسێك ناکەیت کە سەمعە و کەرامەتت بریندار بکات.

ئەوە عیزەتی نەفسە، پارەیەکی مۆڵت دەست دەکەوێت لە کتوپڕێکدا، بەڵام دەستی بۆ نابەیت، چونکە لەئەنجامدا ناوبانگت خراپ دەکات، لەبەر شەخسیەتی خۆت ئەو پارە حەرامە مۆڵە، واز لێدێنیت، لە کاتێکدا دەشتوانیت بیخۆیت.

## مەرگی خۆیانی پێ خۆشتر بوو لەزەلیلی

مەلای گەورەی کۆیە ڕەحمەتی خوای لێبێت لە تەفسیرەکەیدا، دەفەرمووێت: لە شاری کۆیە کابرایەکی ئاسنگەر هەبوو، ناوی وەستا مەعروفی حەداد بوو، کوڕی ئەحمەد شەپەی حەداد، ئەو پیاوە پیاوێکی عیزەتدار، دەست پاك، بە ویژدان بە ئاسنگەریەوە خۆی و ماڵ و منداڵی دەژیاند، ساڵی ١٩٣٦، کە گرانیەکی گەورە ڕووی کردە کوردستان، قات و قڕیەکی وابوو نان بە زەحمەت دەست دەکەوت، خەڵك لەبەر نانەکە وازی لەخانوو دەرگاو پەنجەرەو ئەمانە هێنا، کابرا پیشەکەی کەوت، بە مانگیش دوکانەکەی دینارێکی تیاپەیدا نەدەکرا، وە زەوی و موڵك و ماڵێکیشی نەبوو کشتوکاڵێکی لێبکات و ئەوەشی دەکرا هەمووی سن و کوللە لەناوی دەبرد و نەدەبوو.

مەلای گەورە دەڵێت: ئەم پیاوە ئەوەندە عیزەتی نەفسی بەرزبوو، منداڵەکانیو خێزانی کۆدەکاتەوە و دەڵێت: تا ئێستا بەم تەمەنە گەیشتووم، نانی زەلیلیم نەخواردووە، لە دەرگای ماڵێکم نەداوە دەرگام بەڕوودا دابخرێت، وەرن دەرگاکە لەپشتەوە دادەخەینو بچنە ناو جێگاوە، هەتا خوا ڕۆحمان لێ دەستێنێت سواڵ ناکەین و عیزەتی نەفسمان با نەشکێت.

دواتر دوای ڕۆژگارانێك کە ئەم ماڵە هیچ هەست و خوستیان نابێت، دەرگاکە دەشکێنن، منداڵێکیان ماوە بەحاڵ قسە دەکات، دەڵێت ئەمە قسەکانی باوکم بوو، وتی مردن خۆشترە لەناو جێگای خۆتدا نەك بە زەلیلی و ناعیزەتی لە دەرگای خەڵك بدەیت و خەڵك لێت نەکاتەوە و پاڵت پێوە بنێت، وەرن با بمرین بە عیزەتەوە، جا مەلای گەورە دەفەرمووێت: زۆر کەس هەبوو عیزەتدار بوو لەم

مللەتی کوردەدا، مردنی هەڵبژارد بەڵام زەلیلی و عارەقی شەرمەزاری بە نێوچاوانیەوە نەبیندرێت.

**هەر کەسێك عیزەتی نەفسی نەبێت، دوو شتی پێ ناکرێت:**

**یەکەم: لە کارە ڕیسواکەرەکان خۆی بۆ ناپارێزرێت،**

گەر سەیری بەرتیل بکەین، کە ئینسان ڕیسوا دەکات، کەم نرخی دەکات، لە دائیرەی وادا باسی کەسێك دەکرێت کەس ناوێرێت باسی بەرتیل بکات لەئاستیدا، دەڵێ فلان کەس و بەرتیل؟! هەر جورئەتی ئەوە ناکەیت، ئەوەندە شەخسیەتی بەرزە، خەڵکێك زات ناکات بوێرێت هەر باسی وشەی بەرتیلیشی لەلا بهێنێت، ئەم ئینسانانە چەند گەورەن لە کۆمەڵدا، هی واش هەیە هەر کەوتت ئیشی فلان دائیرە و فلان کەس، دەڵێت بەرتیلەکەی بۆ حازر بکە، بەخوا نوکە قەڵەمی لێنادات دەمی چەور نەکەیت!

کەسێك باسی کرد وتی: ئیشم کەوتە دائیرەیەك، ئیشەکە مافی خۆیشم بوو، بەڵام پێچ و پەنایان تێخستبوو نەدەکرا لەڕێی کەسێکەوە کە بەرتیلی دەدا بەو پیاوە و لە منی وەرنەدەگرت، بەس ئەو بۆی وەردەگرت داوای پێنج وەرەقەی کردبوو، پێنج سەد دۆلار، وتم: زۆرە و ئەویش پێی وتبوو زۆرە، ئاخری هێنامانە سەر پێنج دۆلار! کارتێکی مۆبایل بە پێنج دۆلارە..

وتی هەر شتێك دەبێت وەربگرم، حەقی خۆشی بێت بەبێ شت نایکەم، لە پێنج سەد دۆلارەوە هاتە سەر پێنج دۆلار، کە عیزەتی نەفس نەما خۆت لەڕەفتارە دزێوەکان ناپارێزرێت.

دووەمیان: ناتوانێت ببێتە پێشەنگی خەڵکی

هەر کەسێك کەسایەتی نەبێت، عیزەتی نەفسی نەبێت، ناتوانێت ببێتە پێشەنگی خەڵکیش، چاوساغی خەڵکیش، برا گەورە و ڕابەری خەڵکیش ئەبێ لە نەفسی خۆتەوە دەست پێ بکەیت، گەر سەیری قورئان بکەین ڕوو لە پێغەمبەر دەکات ﷺ:

ئایەتی یەکەم: (ٱقۡرَأۡ) خۆت بخوێنە، فاعیلەکەی (أنت)یە ئەی محمد ﷺ بخوێنە.

ئایەتی دووەم: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ۝ قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا ۝﴾ المُزَّمِّل: ١ ـ ٢. (قُمِ) هەر خۆت (أنت) هەستە شەونوێژ بکە بەینی خۆتو پەروەردگارت پتەو بکە، لەدوعاکانی شەو نوێژ و سوجدەی شەوانەو فرمێسك و گریانی ناڵەی نیوە شەواندا، ئینسان بەو عیبادەتی نیوە شەوانە کە خۆتو خوا نەبێت کەس ئاگای لێ نیە، پەیوەندیت لەگەڵ خوا بەهێز دەبێت.

ئایەتی سێهەم: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ۝ قُمۡ فَأَنذِرۡ ۝﴾ المُدَّثِّر: ١ ـ ٢. هەر (قُمۡ) هەر لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەتەنیا، هەستە ئینزار بکە، هیمەتت هەبێت، هەوڵت هەبێت، ئەوەی پێتە بیڵێ، ئەها سەیریکە هەتا عیلمی پێنەبێت، هەتاوەکو تەقوا و خواپەرستی لە چڵە پۆپەدا نەبێت، هەتا هەوڵ و هیمەتت نەبێت، وەکو خۆت هەر لەگەڵ خۆیەتی، لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ، باسی کەسی تر نیە ئەمجا کە پێغەمبەر شەخسیەتی کامڵ بوو، کەسایەتی تەواو دروست بوو.. ئەمجا دەفەرمووێت (وَأَنذِرۡ) بەلام کێ؟! (عَشِيرَتَكَ) خزمەکانت، لەناو خزم و

قەومەکەشتدا کێ؟! (ٱلۡأَقۡرَبِينَ) الشعراء: ٢١٤. نەك قريب (ٱلۡأَقۡرَبِينَ)ەکانيان، کامە خزمەی زۆر لێت نزيکە، لەوانەوە دەست پێبکە و بانگيان بکە، ئاگاداريان بکە لە سزای خوا، بيانترسێنە..

دەربڕينەکانی قورئان زۆر جوانن، يەکەمجار نەفسی خۆت، ئەمجا ماڵ و منداڵت، ئەمجا خزمەکانت، چونکە تا خۆت دروست نەکەيت، منداڵەکەشت بەقسەت ناکات، تا منداڵەکەت بەقسەت نەکات، خزمی خۆت بەقسەت نەکات، خزمی دوور گوێت لێناگرێت..

دواتر: ﴿لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلۡقُرَىٰ وَمَنۡ حَوۡلَهَا﴾ الشورى: ٧. ئەمجا بڕۆ بۆناو شاری مەککە، ئەمجا کە شاری مەککەت دەست پێکرد ئەمجا پەلی زياتر بهاوە بڕۆ بۆ: (وَمَنۡ حَوۡلَهَا) دیو شارەکانی دەوروبەری مەککە، ئەمجا دوای ئەوە: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا﴾ سبأ: ٢٨. ئەمجا بۆ عالەم.

بۆيە ئەمە وانەيەکی گەورەيە، هەر کەسێك شەخسيەتی خۆی بەرز نەبێت، کاريگەری لەسەر ژن و منداڵيشی دروست نابێت، هەر کەسێك لەناو ماڵی خۆيدا ڕێك و پێك نەبێت، جا ئەگەر ماڵێکيت، ئەگەر حکومەتێکی لەماڵەکەی خۆتدا پتەو شەخسيەت پارێزراو نەبيت، خەڵك متمانەت پێ ناکات. دەبێت وريا بيت، ئەوەی لێت نزيکە لەدەستی نەدەيت، يەکەمجار خۆت دروست بکە، دووەم ئاگات لە دەوروبەرت بێت، ئەمجا پەل بهاوە بۆ خەڵك، بتەوێت خەڵکی دوور دۆستت بێ و ماڵی خۆتو کەسايەتيت وێران بێت، ئەمە لە تەعبيری قورئانيەوە دوورە. خۆشە ئينسان ئەوەندە خاوەن شەخسيەت بێت، حيسابی چەند پياوێکی بۆ بکرێت..

**ئەو پەنجەیەی بەسوپایەك!**

لە غەزای تورکەکاندا، قوتەیبەی کوڕی موسلیم سەرکردەی بەناوبانگی ئیسلام، بەناو سوپاکەدا دەگەڕا و ئامادەی ئەوە بوون هێرشیان بۆ بکرێتو هێرش بەرن، لەو کاتەدا زاناو خواناسی بەناوبانگ محمدی کوڕی واسیع دیار نەبوو، قوتەیبە بە شوێنیدا دەگەڕا نەیدۆزیەوە، سەربازێکی ڕاسپارد وتی بەدوی محمدی کوڕی واسیعدا، ئەو عالم و زانا و خواناسە گەورەدا بگەڕێ..

ئەفەرمووێت: کاتێك کە چوو لە پەنای درەختێکدا، ڕمەکەی هێناوە لەژێر چەناگەی داناوە و پەنجەی شایەتمانی بەرز کردۆتەوە و بۆ لای خوای گەورە و بەرەو ئاسمان و لە خوا دەپاڕێتەوە و فرمێسك دەڕێژێت!

هاتەوەو وتی: ئەی ئیمام، ئەی قوتەیبە، ئەم پیاوە باشە محمدی کوڕی واسیعم دۆزیوەتەوە..

وتی: لەگەڵمدا وەرە، کە چوون ئەم لەگەڵ خوای خۆیدا لەگەڵ موناجاتا تێکەڵاو بووبوو، ئاگای لەوان نەبوو کە قسە دەکەن و لەدەوروبەرین، پەنجەی شایەتمانی بۆ لای ئاسمان بەرز کردبویەوە..

دەفەرمووێت: کاتێك کە ئەم سەرکردە، قوتەیبەی کوڕی موسلیم، ئەمەی بینی، ئەم قەولە جوانەی فەرموو: (سَبابَتُهُ تِلْكَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ مئة أَلف جُنْدٍ) قەسەم بە خوا، ئەو پەنجەی شایەتمانەی ئائەم محمدی کوڕی واسعە، کە بەرزی کردۆتەوە بۆ ئاسمان و دوعا دەکات لە خزمەت پەروەردگاردا، بەلای منی سەرکردەی سەربازی ئەم سوپایەوە، خۆشەویسترە لە سەد هەزار سەرباز. سەد هەزار سەربازی ترم لەگەڵ بوایە، جەنگاوەر، بەقەدەر پەنجەی شایەتمانەکەی محمدی کوڕی واسع شایم پێنەبوو، پشتم پێنەدەبەست.

## کەسێتی بەرز ئاژەڵانیش پێی سەرسامن!

ئەگەر کەسێك کەسایەتی و شەخسیەتی بەهێز بوو، ئاژەڵەکانیش پێی موعجەب دەبن، ئەوەتانێ یەکێك لە زانایانی ئیسلام (ئەبولقاسمی قەشیری) کە ئیبنو خەلەکان لە بارەیەوە دەفەرمووێت: (**عَلاّمَةٌ في الفقه وَ التفسيرِ وَ الحَديثِ وَ الأُصولِ وَ الأَدَبِ وَ الكِتابَةِ وَ الشعرِ**).

بەڕاستی لە چڵە پۆپەدا بوو، عەلامە بوو، لە شەرع و لە تەفسیر و لە حەدیس و لە شیعر و لە ئەدەب و لە نوسیندا خاوەنی (التفسيرُ الكبير) کە لە باشترین تەفسیرەکانی قورئانە، کە ئیمامی ذهبي لە (**سيرُ الأَعلامُ النُبَلاء**) دا دەفەرمووێت: (**كانَ عَديمُ النَظيرِ في السُلُوكِ والتذكير لَطيفُ العِبارَةِ طَيِّبُ الأَخْلاقِ**) بەڕاستی پیاوێکی کەم وێنە بوو لە ڕەوشت بەرزی و ئەخلاق جوانی و زمان شیرینیدا، لە کتێبدا باسی دەکرێت مێژوو ناوی تۆمار دەکات..

ئیمامی (إبْنُ كَثير) دەفەرمووێت: ئەم پیاو باشە تەمەنی حەفتا ساڵ بوو، لە نیسابوور کۆچی دوایی کرد، هەموو خەڵکی شارەکە بۆی دەگریان، ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە لە هەموویان زیاتر ئەوەبوو: ئەم پیاوە ئەسپێکی سواری هەبوو، چەند ساڵ لەماڵەکەیدا بوو، وەکو سەیارەی ئەمڕۆ..

کاتێك لە سەرقەبران گەڕانەوەو ئەم ئەسپە هەستی بەوە کرد خاوەنەکەی مردووە، ئەم پیاو باشە مردووە، مانی گرت لە خواردن و خواردنەوە، ئاو و عەلەفی نەخوارد هەتا گیانی دا و ڕۆحی دەرچوو! ئەوەندە سەرسام بووە بە شەخسیەتی ئەم خاوەنەی، چونکە ڕۆژێك ئازاری نەداوە، چونکە ڕۆژێك ستەمی لێنەکردووە، نەك هەر مرۆڤەکان ئەم ئاژەڵە بێزمانەش موعجەب بوو بە کەسایەتی

ئەم زاتە گەورە، خواردن و خواردنەوەی نەخوارد هەتا وەك خاوەنەکەی گیانی لەدەستداو دونیای بەجێهێشت.

ئەمڕۆ ئەگەر ئەم ولاّخە بەرزە نەبێت، سەیارەیەکت پێیە، چەند جوانە سەیارەکەش سەرسام بێت بە شەخسیەتت. وەلاّهی سەیارەش سەرسامە بە شەخسیەتی شۆفێرەکەی، چونکە لە لێخوڕیندا دەردەکەوێت، بەلاّم کەسایەتیەکە دەیگۆڕێت، کەسی واهەیە بە ماتۆڕ دەڕوات، بە پاسکیل دەڕوات، شەخسیەتی بەرزترە لەو کەسەی کەوا سەیارەیەکی مۆدێل بەرز لێدەخوڕێت، چونکە کە لێدەخوڕێت ئەوەندە بە ئەدەب لێدەخوڕێت، هێندە ڕێنماییەکانی هاتووچۆ ڕەچاو دەکات، هێندە ڕێك و پێکە کەس ئازار نادات..

کەسیش هەیە گرانترین سەیارەی پێیە ئەوەندە بە ناشیرینی لێدەخوڕێت، ئەوەی بەلایدا دەڕوات جوێنی پێدەدات، یان ئاواتی ئەوەی بۆ دەخوازێت هیچی نەبێت!

خەڵکانی دەرەوە –ئەورووپاو وڵاتە پێشکەوتوەکان– پێیان شەرمە ئیجازەکەی ئیشارەتی سەرپێچی لێبدرێت، ئەڵێ کەسایەتم ڕوشاوە، لە ئادابی شۆفێری لام داوە..

بەڵام لێرە هەندێکەس شانازی بەوەوە دەکات کە شانازی بەسەر پۆلیسی هاتو چۆدا بکاتو وەڵامیشی نەداتەوە. یان دەڵێ ئەمە چیە دەڵێت غرامەیە و پارەکەی دەدەم..



## بەهێزکردنی کەسایەتی

گەر بمانەوێت شەخسیەتمان پارێزراوبێت، خاوەنی قەدر و حورمەت بین لەناو خەڵکدا، با پەیوەندیمان لەگەڵ پەروەردگاردا بەهێز بکەین، وەك خوادەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ سەیری قورئان بکەن، تەعبیرەکانی چەند وردە! نافەرموێت: (**العزّةُ لله**) خۆ هەمان مەعنای دەبوو، دەفەرمووێت: ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ﴾ جارو مەجرور لە زمانی عەرەبیدا لە هەر شوێنێکدا پێشکەوتبوو (حەصرە) واتە: عیزەت و سەربەرزی بەس بۆ خوایە، بۆ پێغەمبەرەکەیەتی، بۆ ئیمانداری ڕاستەقینەیە، ئەو ئیماندارەی کە لەسەر ڕێبازی خوا و پێغەمبەرە ﷺ، عیزەتت دەوێت لەسەر ڕێبازی خوا بە، ئەگەر عیزەتت دەوێت شوێنکەوتووی سوننەتی پێغەمبەری خوابە ﷺ، چونکە سنورداره لەودا، بۆ؟!

ئەگەر عیزەت و سەربەرزی تۆ، شکۆمەندی و کەسایەتیت لەناو خەڵکدا بەهۆی حیزبێکەوە بێت، دڵنیابە ماوەیەکەو دیاری کراوە، ئامانجێکی هەیە هەتا ئەم حیزبە بەکۆمەڵگا کۆمەڵە خەڵکێك دەگەیەنێتە شوێنێكو ئاستێکی دیاری کراو، دوایی کۆتای پێدێت.

ئەگەر شەخسیەتی تۆ بە فلان کاربەدەستو کاربەدەست بێت، بڵێی فلان کەس دەناسم لە ئەنجومەنی وەزیران، لە سەرکردایەتی، لە مەکتەبی سیاسی حیزبێك.. ئاخر فلان کەس هەموو ڕۆژێك نامێنێت، کە ئەو مرد کەسایەتی تۆش لەناوچوو.. ئەویش هەر دەمرێت، یان ئەو بەرپرسیارێتیەی نامێنێت.. ئەگەر کەسایەتی تۆ بە ماڵ و سامانەکەت بێت، یان ماڵ و سامانەکەت لە دەست دەدەیت، یان ئەگەر بشت مێنێت بۆ خۆت پەکت دەکەوێت، یان نەخۆش

دەکەویت، هەرچی ئەو ماڵ و سامانەیە دادی تۆ نادات، یان پیر و کە نەفتی ناو جێگا دەبیت، هەر سوودت پێناگەیەنێت! کەواتە شەخسیەتی خۆت ببەستە بە زاتی پەروەردگارەوە، پەیوەندیت لەگەڵ خوادا پتەو بکە..

## خوا پشتیوانی بە شەخسیەتەکانە!

پیاوێکی بەرێز لە ساڵەکانی هەشتادا، لە ناوچەی شارباژێڕدا سەرباز دەبێت، ئەگیرێت بە سەربازی و لە فەوجێکدا لای بەرپرسی فەوجێك. دوای ئەوەی تاقی دەکرێتەوە، ئەڵێ وەڵاهی من حەزم لە پیشەی چێشت لێنانە، تەباخی باش دەزانم، چێشتی باش لێدەنێم. کاتی خۆی دیارە ئەو نیشانەشی لە چێشتخانەدا کردووە، ئەڵێن زۆر باشە.. پاك و خاوێنیش دەپارێزێت، لەسەر چێشتخانەی فەوجەکە دایدەنێن..

ڕۆژێك نەقیبەکە کە بەرپرسی فەوج دەبێت، لەگەڵ خۆیدا و دوو سێ نەفەری ترو کۆمەڵێك ئەفسەری خوارترەوە مولازمێك ئەچنە دەشتێك، لەناوچەی شارباژێڕدا، لەو کاتەدا لە دێیەك نزیك دەبنەوە، قەلێك دەبینن، کابرای بەرپرسی فەوج بەکابرای چێشتلێنەری کوردی خۆمان دەڵێت، برۆ ئەو قەلە بگرە و سەری ببڕەو بیکە بە خواردنی ئێوارە..

ئەویش دەڵێت (سیِّدي) گەورەم، ئەوە ماڵی خەڵکە، ئەوە خوا دەزانێت هی چ کەسێکە، چەند دەمێکە بەخێوی دەکات هەتا بۆتە ئەو قەلە، ئەوە خاوەنی هەیە قوربان، خۆ ئەوە قەلی کێوی نیە..

ئەڵێ بۆ وائەزانی من نازانم، ئەوە قەلی ماڵان نیە، ئەوە چیە، قسە لە قسەمدا

دەکەیت، هەر خێرا برۆ ئێستا بیگرە و سەری برە و ئێوارە ئامادەی بکە. ئەڵێ سوێند بەخوا من بەم تەمەنە گەیشتوم، دەستم بە ماڵی هیچ کەسێك نەکەوتووە لەم سەر زەویەدا بە حەرامی، گەورەم ئەوە حەرامە، دەستم بە ماڵی حەرامی هیچ بەشەرێك نەکەوتووە..

کابرا تورە دەبێت و دەڵێت، کەس بۆی نیە قسە لە قسەمدا بکات! ئادەی حەبلێك بهێنن و بیبەستنەوە و لەو سەر لوتکەی شاخەوە فرێی بدەنە خوارەوە، حیمایەکان رادەکەن و حەبلەکە دێنن و قاچی دەبەستن، ئەفسەرەکانی پلە خوارتر زۆر لێی دەپارێنەوە ئەڵێن ئەم پیاوە پیاوێکی بە خزمەتە، دەست پاکە، پاك و خاوێنە، چێشت و خواردنی خۆشت و باشمان بۆ ئامادە دەکات، ئەمجارە لەبەر خاتری ئێمە عەفووی بکە.. بەڵام زۆری قسە پێدەڵێ و دەڵێ برۆ بەڵام رۆژێك هەر دەبێت تۆڵەی ئەوەت لێبکەمەوە، لەبەر خاتری ئەم پیاوە بەرێزانە عەفوویە.

دێنەوە بۆ فەوجەکە، ئەم پیاوە دەڵێت: ئەو شەوە خەوم لێنەدەکەوت، چونکە قەت قسەم پێنەوترا بوو شەخسیەتم نەشکێنرابوو، پیاوی بە عیزەت بەیەك قسە دەمرێت، پیاوی هیچ هەزار قسەشی پێ بوترێت بە خەیاڵیدا نایەت.

دەڵێت: زۆر دەروونم نائارام بوو، خەوم لێنەدەکەوت، هەستام دەست نوێژم گرت، دوو رکات نوێژم کرد و لە خوا پاڕامەوە و وتم: خوایە لەم شوێنە و لەم ئینسانە رزگارم بکەیت، نەفسم پێی شکاوە..

دەفەرمووێت: هەر خەوم لێنەکەوتبوو، لەسەر قەرەوێڵەکەم راکشام و لە دەرگا درا وامزانی سەربازەکانن بۆ هەندێك شت هاتوون.. دەڵێت سەیرم کرد کابرای زابتە و بە جلی خەوەوە و بە حیمایەوە خۆی کرد بە ژوورەکەدا..

وتم: لەوە ئەچێت هاتبێت هێشتا ڕقی نەنیشتبێتەوە پێم بڕێژێت، دەستی برد دەستم ماچ بکات!

وتم: گەورەم ئەوە چی دەکەیت؟!

وتی: توخوا گەردنم ئازاد بکە، لەخوا بپاڕێوە خوا عەفووم بکات، وتم: بۆچی؟!!

وتی: من لە ئێوارەوە دەخەوم سێ جار ئەمشەو پێیان وتم هەستە گەردنت بە فلاَن کەس ئازاد بکە، ئەینا دەست دەخەینە قوڕگتەوە و دەتخنکێنین، هەناسەم گیراو واخنکاندمیان، گەردنم ئازاد بکە و ڕزگارم بکە. وەلەم فەوجەشدا ئیجازە بە دەستی خۆتە کوێت پێ خۆش بوو لەوێ کار بکە، بەس تو خوا ڕزگارم بکە.. من هەڵەم کرد تۆ پیاوێکی بەڕێزیت!

منیش وتم: وەلآهی من ئێستە لەسەر بەرماڵ بووم، ئەوە هی پیاوچاکی و بەڕێزی من نیە، ئەوە هی خوایە تۆش وەرە وەك من خوا بناسە، خۆت لە حەرام بپارێزە، لەگەڵ خوادا پارێزراو بە، وەلآهی هیچ کەس ناتوانێت سەمعەت بشکێنێت..

بەسەرهات

لە تەفسیری مەلای گەورەی کۆیەدا، -خودا لێی خۆش بێت- بەسەرهاتێکی زۆر سەرنج ڕاکێشی لەسەر عیزەتی نەفس تێدایە، دەڵێت: پیاوێك لە شاری بەغداد لە سەردەمی (مەئمونی کوڕی هارونە ڕەشید)دا ئیشی ئەوە بوو زێرابی پاك دەکردەوە، زێرابی ئەو زەمانە هی کاربەدەستانو ماڵە دەوڵەمەندەکان

بیریان لێدەدا، خەڵکی تریش دەچووە وەك وڵاتی خۆمان لە پشتیر دادەنیشت، بەڵام ئەوان ئاودەستیان هەبوو، چاڵێکیان لێدەدا و سەریان دادەپۆشی بوو کە پڕ دەبوو، سەیارەی پیسی پاك کردنەوەی شارەوانی وەك ئەم سەردەمە نەبووە، ئەبوایە بە سەتڵ دەریان بهێنایە، کابرا بە سەتڵ ئەو پیسایەی ئەو ماڵەی دەبرد لە دەرەوەی ئاوایی دەیڕشت، لە دەرەوەی شار! ئەوە زۆر سەیرەو قورسە بە هەموو کەس ناکرێت.

ئەڵێ کابرا هەموو لەشی پیسای پێدا دەهاتە خوارەوە، خەڵك کە بەلایدا دەڕۆیشت گاڵتەیان پێدەکرد، دەیان وت ئەی لەو پیاوە ئەمە چی دەکات، ئەویش بە خۆی دەگوت، لەبەر خۆیەوە دەیگوت، نەفسەکە پێت ناخۆش نەبێت، خەڵك وات پێدەڵێت، سوێند بەخوا واز لەم پیشە بهێنیت خراپترت پێدەکەم، دەبێ ئیشێکی لەمە ڕەزیل تر و چروکتر بکەیت!

مەئمونی کوڕی هارونە ڕەشید ئەو ڕۆژەی سەرەی پاك کردنەوەی ئاودەستەکانی ئەوان بوو، ماڵی خەلیفە و کۆشك، گوێی لەم پیاوە بوو وای بە خۆی دەوت، کەسیشی لەگەڵ نەبوو وای بە خۆی دەوت، نەفسەکە ئەم ئیشەت باشترە بێتو خۆت بەشەرمەزار بزانیت، لەمە خراپترت پێدەکەم! مەئمون بانگی کرد وتی: جابۆ فلاَن کەس لەمە خراپتر هەیە وا پیسی بە هەموو لەشتدا دێتە خوارەوە؟!

وتی: بەڵێ قوربان هەیە، وتی: چیە؟

وتی: خزمەتکاری ماڵانە، خزمەتکاری و تەقریر نوسی و ڕاپۆرت نووسی و کاسە لێسیە، ئەوە لەمە خراپترە، وتی: چۆن؟!

وتی: قوربان من بەکرێ ئیش دەکەم، پیشەکەم خوای گەورە نانی لەسەر ئائەمە داوم، خزمەتێکیشە بۆ ولآتەکە، لە جیاتی هەموو ولآت ببێتە چاڵە پیسی، من یەك چاڵ لە شوێنێکدا دەهێڵمەوەو خاوێنی دەکەمەوەو ئێوارە دەڕۆمەوە، ڕاستە هەموو لەشم پیسە، بەلآم لە دەرەوەی ماڵەکەمدا شوێنێکیان بۆ داناوم، خێزانم جلی خاوێنی بۆ داناوم، دوو سەتڵ ئاو بەخۆمدا دەکەم و هەرچی پیسیە لە لاشەمدا پاك دەبێتەوە، جلی خاوێن لەبەر دەکەمو کرێکەی ئەو ڕۆژەم داوە بە کۆمەڵێك خواردنو سەریەرزو ڕێزدار لەگەڵ خێزانەکەمدا دەیخۆم، ئێوارە ئانیشکی لێ دادەدەم، شا بە سەپانی خۆم نازانم، کەس ناتوانێت پێم بڵێت وا بکە، یان وا مەکە!

تو خوا جەنابی خەلیفە، ئەمەی من زەلیلیە یان کابرایەك دەست لەسەر سنگ دانیشتووە و –تَحْتَ الأوامرِ–، کابراکەی ئەمری بەسەردا بکات، ئەگەر نانی خوارد ئەم بەرماوەکەی بخوات، بۆیە بە نەفسی خۆم دەڵێم، وەلآهی ئەگەر ئەم ئیشەت پێ عەیبە بێت، دەتکەم بە خزمەتکاری مالآن!

خەڵکی چەند تێگەیشتوو هەبووە! کابرا مەئمون ویستی خەلآتی بکات، کیسەیەك پارەی دایە، وتی: قەسەم بە خوا وەری ناگرم، چونکە ئەمەش زەلیلیە، ئەبێ ئەوەی وەریبگرم ڕەنجی ئەو شان باڵەی خۆم بێت، نەك کیسە پارەی بەردەمی سوڵتان بێت!

خەڵکێك ئاوا بە عیزەتەوە ژیاوە.. وەپاشانیش عیزەتی خۆت لەگەڵ خوای پەروەردگاردا، بپارێزە چونکە دەچیەوە ناو قەبرێك کە ئەوانەی کە زۆر خۆشیان دەوێی زۆر موعجەبن بە شەخسیەتت، هەر لێواری قەبرەکە دەبینن، نایەنە سەر ڕۆخارەکەشی!

## شەخسیەتدار ئەوەیە لای خوا شەخسیەتت هەبێت

پێغەمبەری خوا ﷺ لە غەزای تەبوکدا کە شاری مەدینەی بەجێهێشت، پیاوێك، صەحابەیەك هەبوو (ناوی موعاویەی کوڕی موعاویەی موزەنی) بوو گرانەتای گرتبوو، زۆر نەخۆش بوو، لە جێگەدا کەوتبوو، پێغەمبەر ﷺ سەردانی کردو داوای حەکمیان کرد زۆر عیلاجیان کرد، هەر چاك نەبوو، قاچی نەدەگرت، لە جێگادا کەوتبوو. داوای لێبوردنی لە خواو پێغەمبەری خوای کرد ﷺ کە ناتوانێت بەشداری ئەم غەزایە بکات، وەکو غەزاکانی تر.

پێغەمبەری خوا دوعای بۆ کردو خواحافیزی لێکردو لەشکر ڕۆیشت، مسوڵمانان دوورکەوتنەوە چوونە تەبوك لە گەڕانەوەدا شەوێك لە شوێنێکدا لایان دابوو، نیوەی شەو بوو، پێغەمبەر ﷺ خێمەیەکی بچکۆلەیان بۆ هەڵدابوو. دەفەرمووێت: صەحابەکانی هەستان لەخەو لە خێمەکە هاتە دەرەوە، فەرمووی هەستن و ڕیز بن نوێژی جەنازە دەکەین، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کێ وەفاتی کردووە، ئەوانەی لێرەین هەموو زیندووین، نوێژ لەسەر چی بکەین؟!

فەرمووی: نوێژی جەنازە بە غائیب، بەناحازر لەسەر هاوەڵی بەڕێزم (موعاویە) کە لەشاری مەدینە وەفاتی کردووە..

وتیان: بە چیدا دەزانیت؟!

فەرمووی: ئێستا جوبریلم لابوو، لە ئاسمانەوە، لە عەرشی عەزیمەوە هاتوە.. ئەی محمد لەم خێمە وەرە دەرەوە، وتم: ئەی جوبریل بۆ لێرە نوێژەکەی لەسەر نەکەم کە موعاویە وەفاتی کردووە؟!

فەرمووی: چونکە جێتان نابێتەوە، دوو ڕیز مەلائیکەت لە ئاسمانەوە دابەزیون، هەر ڕیزەی حەفتا هەزار مەلائیکەتە، لەو دەشتەدا صەفیان بەستووەو چاوەڕێی ئیمامەتی کۆتایی پێغەمبەرانن، کە نوێژ لەسەر یەکێك لە ئیماندارانی ئومەتت بکەیت کە لە شاری مەدینە مردووە!

-سبحان الله- لەو شەخسیەتە، ئەمە لەبەر چی ئەی جوبریل؟! پێغەمبەری خوا سەری دەسوڕمێت، ئەی جوبریل ئەم پیاوە بەچی پلە و پایەی لای خوا بەرز بۆوە؟! فەرمووی: بەوەی سورەتی ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ی زۆر دەخوێندو زۆر خۆشیدەویست، کە باسی یەکتا پەرستی، بێ ئحتیاجی خوا دەکات، کە هەموومان موحتاجین بە خوا.

خوا پێویستی بەکەس نیە، خوا کەسی لێنەبووە، لە کەس نابێت، باوك و دایکی کەس نیە و ئەولادی نیە، ﴿ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ﴾ە، هەرچی لەم گەردونەدایە پێویستی بە خوایە، خوا پێویستی بەکەس نیە. دەی تۆ لەگەڵ ئەو سورەتی (قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ)دا بە مەعناوە بژی، تەوحید و یەکتا پەرستیت -خالیصاً موخلیصاً- پاك بێت. خوا ئاوا خۆشی دەوێیت، ئەوە هەر بۆ ئەو صەحابە نیە، بۆ هەر کەسێك لە ئیماندارانی ئومەتی پێغەمبەرە ﷺ، ئەوە کەسایەتیە، ئەوە پلە و پایەیە..

بەڵام بەداخەوە ئەمڕۆ بەهۆی ئەوەی کە سەروەتو سامان و پارە بۆتە سەنگی مەحەکی ڕێز و حورمەتی خەڵك، وای لێدێت ئەوەی کە پارەی نەبێت، ئەوەی دەوڵەمەندو سەرمایەدار نەبێت، زۆر بە چاوی ڕێزەوە سەیری ناکرێت، زۆر

شەخسیەتدار نابێت! ئەمە وای کردووە ئەوەی هەژارە هەوڵی پارە پەیدا کردن دەدات، تەنانەت جاری وامەیە دەڵێت بۆئەوەی منیش وەك فلان کەس حورمەتداربم و دەوڵەمەندبم ئامادەیە کەسایەتی خۆی بفەوتێنێت، ئەوەی دەوڵەمەندیشە دەڵێت ئاخر فلان کەس لە من زیاتری هەیە، بەڵکو هەوڵبدەم بگەم بەو، کە گەیشتە ئەو، بگەمە فلان کەسیش، کە هەر ناشگاتە سەرو خۆی، لە ئەنجامدا ناگاتە هیچ..

زۆر دەوڵەمەند هەیە ئەو هەموو سامانە نەیتوانیوە حورمەتی بۆ پەیدا بکات، شەخسیەتی خۆی فەوتاندووە، جێگەی داخە ئینسان بە عیزەتەوە نەژی لەناو خەڵکدا، ڕێزو کەسایەتیشی پارێزراو بێت لای خواو پێغەمبەرەکەی لە قیامەتدا.

## تەمەن چیە؟

تەمەن کە دەرفەتی ژینە،

وێنەی خەونی ساتێکە

یا پشووی ژێر ساباتێکە..

زوو دێت و زووش بەسەر دەچێت

وەك شیر لەناکاو هەڵدەچێت!

گلۆڵەی دەم هەڵدێرێکە، وەکو دەڵێن کورتە پێچی مێزەرێکە..

چۆن دەخەویت ئاواش دەمریت، چۆن هەڵدەستیت ئاواش لەو خاکە دێیتەدەر، ئەی نازانیت وتیان بە نوح، ئەرێ پیری پێغەمبەران، تەمەنی زۆرتر بردە سەر، دنیات چۆن هاتە بەر نەزەر؟

فەرمووی: خانووی دوودەرگا بوو، لەم یانەوە هاتمە ژوورو، لە ئەویانەوە چوومەدەر!

تەمەنت تاقیگەیەکە، وەڵامی پرسیارەکانت بدەرەوە،

زۆرت بە نادانی کێڵا، شکاویەکان چاك بکەرەوە..

بۆئەوەی شەخسیەتت سپی بێت، لە ڕووباری تەوبەدا خۆت پاك بکەرەوە..



# بەشی چوارەم

# پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کردەوانە ئاگادارمان دەکاتەوە کە کەسایەتی مرۆڤ لەکەدار دەکەن

## خاڵە بنەڕەتیەکانی ئەم بەشە:

❁ قالَ اللهُ تَعالى: ﴿ٱلَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْأَخِرَةِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ﴾ إبراهيم: ٣.

۞ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (لَيْسَ الغِنى عَنْ كَثْرَةِ العَرَضِ، ولَكِنَّ الغِنى غِنى النَّفْسِ). رَواهُ البُخاري: (٦٤٤٦) وَ مُسْلِم: (١٠٥١).

۞ عَنْ أَبي هُرَيرَةَ: كانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إذا عطَسَ وضَعَ يدَهُ أَوْ ثوْبَهُ على فيهِ، وَ خَفَضَ ـ أَو غَضَّ ـ بِها صوْتَهُ). رَواهُ أَبُو داود والترمذي وَ قالَ: حَديثٌ حسَنٌ صَحيح.

۞ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (إذا تثاءبَ أَحَدُكُم، فَليَرُدَّهُ ماستَطاعَ فَإِنَّ أَحَدَكُم إذا تَثاءَبَ ضَحِكَ مِنهُ الشَّيطانُ) رواه البخاري:( ٦٢٢٣).

۞ عَنْ عُمَر بْنِ أَبي سَلَمَة، قالَ: كُنْتُ غُلاماً في حِجْرِ رسُولِ اللهِ ﷺ وكانَتْ يَدي تَطيشُ في الصَّحْفَةِ، فَقالَ لي رَسُولُ اللهِ ﷺ يا غُلام سَمِّ اللهَ تَعالى، وكُلْ بِيَمينِكَ، وَ كُلْ مِمّا يَليكَ). رَواهُ البُخاريُّ: (٥٣٧٦) وَ مُسْلِم: (٢٠٢٢).

۞ عَنْ أَبي مَسْعُودٍ البَدْرِيِّ، قالَ: دَعا رَجُلٌ النَّبِيَّ ﷺ لِطَعامٍ صَنَعَهُ لَهُ خامِسَ خَمْسَةٍ، فَتَبِعَهُمْ رَجُلٌ، فَلَمّا بَلَغَ البابَ، قالَ النَّبِيُّ ﷺ: (إِنَّ هذا تَبِعَنا، فَإِنْ شِئْتَ أَنْ تَأْذَنَ لَهُ، وَ إِنْ شِئْتَ رَجِعَ). قالَ: بَلْ آذَنُ لَهُ يا رَسُولَ اللهِ ﷺ. رَواهُ البُخاريُّ: (٢٠٨١) وَ مُسْلِم: (٢٠٣٦).

**سەرچاوەکان:**


١) گۆڤاری (ژیار)، ژمارە: ١، بەهاری ٢٠١١، ل٢١.

٢) ئەسرینەکانی سەدەی بیستەم، ئاوات أبوبکر أحمد، ب١، ل٣٧. وە:ب١، ل٩٣.

٣) شرح رياض الصّالحين، إِبْنُ عُثَيمين، ج٣، ص١٢٥، ص٢٢.




## ئەو شتە هەڵانەی گرێ دراوە بە کەسایەتیەوە:

بەڕاستی لە ڕۆژگارێکی وەکو ئەمڕۆدا کەسایەتی خەریکە بەهەڵە تەفسیر دەکرێت، وا لێی تێگەیشتوین کە ئینسان چەند شتێك دیاری دەکاتو دەڵێت: ئەگەر ئەمانەی هەبێتو، ئەمانەی لەدەست دا بێت، ئەگەر ئاوا ڕەفتار و کردار بکات لەبەر چاوی خەڵکدا، شەخسیەتی دەبێت. یان ئینسانەکە خۆی وا قەناعەتی بەخۆی کردووە، بۆ نمونە: ئەوە لە ژیانی خۆماندا هەموومان دەیبینین وا دەزانین شەخسیەت ئەوەیە: ئینسان لەشاردا بژی بۆ ئەوەی خەڵك پێت نەڵێن لادێییە، خەڵك خەریکە شەرمەزار دەبێت کە دەڵێت فلاَن کەس لادێییە، لە کاتێکدا خەڵك خۆی بە ڕۆشنبیر دەزانێت، بە خاوەن کەسایەتی دەزانێت، خواردنی چەند ڕۆژەی بەستووی ناو موجەمیدەو سەلاجەو قوتو بخوات، پێی عەیبە خواردنی کوردەواریو تازە پێگەیشتوو بخوات. شەخسیەت دار ئەو کەسەیە ئەنتەرنێت لە ماڵەکەیدا بێت، هەمیشە لاپتۆپێك لەبەردەستیدا بێت، بە موبایلیش بەردەوام گوێ لەشت بگرێ..

شەوان و ڕۆژان لەبەر سپلیت نەبێت نەخەوێت، بە موبەریدەش ڕازی نەبێت، نیوە شەوان بخەوێت! بەلاَم نیوەڕۆیانیش بە دەم باوێشکەوە لەخەو هەڵسێت، ماڵی واهەیە سەعات دە دەچیت کەدێنە دەرەوە هەموو بە جلی خەوەوە دێن، هێشتا هیچی خەو بەری نەداوە، چونکە نیوەی شەو خەوتووە، نوێژی بەیانیشی نەکردووە!

کار نەکەیت مفت موچەیەکی بەلاش وەربگریت، عارەقە بەلاشەتەوە نەبینرێت. ئەگەر دە مەتر ئیشی شوێنێکت هەبێت بەس بە سەیارە بڕۆیت، تا ناو ئەو بازارە

ئیلا سەیارەی تایبەتی خۆت بەریت بۆ ئەوەی نەڵێن فلآن کەس بە پێ ڕۆشتووە، عەیبە ماڵت هەمووی کاشی بیۆ چیمەنتۆ بێت تۆزێك گڵۆ باخچەیەكو گوڵێکی تێدا نەبێت! لە ژوورەکانتدا گوڵی پلاستیکی هەبێت.. ئەمانە بوونە دیاردەیەك ئەمڕۆ ئەوەی کە هەیبێت خۆی بە خاوەن شەخسیەت دەزانێت، خەڵکیش ئاماژەی پێدەکەن، ئەها فلآن کەس چۆنە، ئەمانەی هەموو هەیە! تەنانەت ئەگەر کچ بدات بە شوو ئەمانەی هەبێت ڕەغبەتی زیاتر دەبێت، وە ئەگەر کوڕ بێ و خوازبێنی کچێك بکات سەیری ئەمانەی ماڵیان دەکرێت..

بەڵآم ئەمانە هەمووی بە پێچەوانەوەن، من ناڵێم ئەمانە خراپن، ئەگەر لە سنوری خۆی دەرنەچێت باشن، هەمووی خزمەت گوزارین، تۆ بە موبایلێك بە ئەنتەرنێتێك بە سەتەلایتێك هەموو دونیا دەبینی، وە لە چەند چرکەیەکدا دەنگت بە هەموو شوێنێکی دونیا دەگات، ئەمە خەلآتی خوایە، سوپاسی خوای لەسەر دەکرێت. فێنکەرەوەیەك، سپلیتێك، موبەریدەیەك، شتێکی باشە لە گەرمای هاویندا ڕزگارت بکات، بەڵآم لە سنوری خۆی نەچێتە دەرەوەو وانەبێت شەخسیەتی تۆ هەموو کەلو پەلەکان بێت، بەڵآم ناخت وێران بێت، چونکە ئەگەر ئینسان ئەمانەی هەبیۆ ئیمانی لەگەڵدا کزبێ یان نەبێت، ماڵێك نوێژی بەیانیانی تێدا نەکرێۆ دوو دوعای خێری تێدا نەکرێت، پەنا بەخوای پەروەردگار دوو شت لە دەست دەدەیت:

**یەکەم: بەختەوەری ناو ناخ و دڵ و دەروون:**

جەستەت هەمووی ئاوەدانە، ماڵی گڵۆپ و ڕووناکی زیادە مەسرەفیش زۆر دەکەیت، بەڵآم شوێنێك تاریکە کە ناخە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ها هُنا،

التّقوى ها هُنا) ڕووناکی ئائیرەت کوژاوەتەوە، لەناخەوە هەست دەکەیت دڵتەنگ و دڵگرانیت.

دووەمیان: تەندروستی لە دەست دەدەیت:

تەندروستیت باش نابێت، بەردەوام نەخۆشیەك لە جەستەدا دێ و دەڕوات، هەموو دەمێك پێویستیت بە دکتۆرو چارەسەرو دەرمانە، ئەمڕۆ مرۆڤایەتی ئەوەی ئێمەی تێدا دەژین ئاوایە، یەکەم بەختەوەر نیە، دووەم تەندروست نیە، هەرکەسێ دەبینی نەخۆشیەك لە لاشەیدایەتی، بە گەورەو بچوك ژنو پیاوەوە بە دەستیەوە دەناڵێنێت، هەیە کەمتر هەیە زۆرتر.

ئینسانیش ئەگەر دڵی خۆش بوو، قسەی خۆش دەبێت، ڕووی خۆش دەبێت، دڵی گەش دەبێت، کە تەندروستیت باش بوو پاشایەکیت لەسەر دونیا و منەتت بەکەس نیە، بەڵام کە تەندروستی و بەختەوەریت لە دەستدا، هیچت نەماوە، ئیتر شەخسیەتیشت لەناو خەڵکدا دەڕوات.

## دکتۆرێکی نەخۆش

دکتۆرێکی فەڕەنسی، پسپۆڕی نەشتەرگەری دەمارەکانی مێشكو ئەعصاب بەناوی بێسکی، دکتۆرێکی گەلێك بەناوبانگی جیهانی، بەسەرهاتی خۆیمان بۆ دەگێڕێتەوەو، ئەڵێ: من ئەوەی کە لە ژیانی دونیادا ماددی هەبێت، هەمبووە، ئیتر وەکو لە خانووی باش، ئوتومبیلی باش، جێگەو ڕێگەی باش، بەهەموو خزمەتگوزاریەکەوە، نەخۆشخانەی گەورەو پارەم بە لێشاو هەبوو، بەڵام بەردەوام هەستم دەکرد لە دوو شتدا کەمو کورتیم هەیە:

یەکەم: هیچ کات دڵم خۆش نەبووە، هەمیشە دڵم تەنگ بوو، هەموو دەمێك هەستم بە دڵ تەنگی دەکرد.

دووەمیشیان: لەگەڵ ئەوەدا کە خۆم دکتۆر بووم، ڕۆژانە چارەسەری چەندین نەخۆشم دەکرد، پرۆتساتم لەگەڵ دا بوو تووشبووبووم بە ئینتیهابی بۆریەکانی هەناسەم، بە بەردەوامی دەکزانەوەو سینەم ئازاری هەبوو، چاوم ئاوی سپی تێکەوتبوو، پێویستی بە نەشتەرگەری هەبوو..

ئەم پیاوە بیر دەکاتەوە دەڵێت: ڕۆژێك هاتمە سەر ئەوەی خۆم بکوژم، خۆم لەم ژیانە جەنجاڵە ڕزگار بکەم، وتم: من دوو شتم هەیە یان خۆم نەخۆشم، یان لای نەخۆشم، خۆم دکتۆرم یان بەردەوام نەخۆش دەبینم، ئازارەکانی دەبیستم، یان خۆم ئازارم هەیە. شەو ئازاری خۆم، ڕۆژانە ئازاری خەڵك ببینین! خوایە ئەمە چ ژیانێکە و چ تامێکی هەیە.

دەڵێت بیرم کردەوە و وتم: لەم جەنجاڵی ناو شاری پاریسی فەرەنسا خۆم ڕزگار بکەم، چووم لە بناری شاخێکدا کە دێی باب و باپیرانم بوو، دوو هێکتار زەویم کڕی‌و، بەماڵ و منداڵو کوڕ و کچەکانی وت، خواحافیزیتان لێدەکەم، نە کۆمپیتەرەکەم لەگەڵ خۆمدا دەبەم، نە ئەنتەرنێتەکەم دەبەم، نە موبایلەکەشم بۆ بهێنن! سەیارەتان هەیە ویستتان سەردانم بکەن خۆم دەچم کولانە خانوویەکی دار، وەکو زەمەنی قەدیمی دروست دەکەم.

دەڵێت: دەستم کرد بە باخ دروست کردن، یەك، دوو مانگایەکم ڕاگرت بۆ ئەوەی شیرەکەی بە تەڕو تازەیی بخۆین، لەگەڵ دوو سێ کورە هەنگدا، کە هەنگوینی تازەم بداتێ، خێزانیشم لەگەڵمدا هاتو بەجێی نەهێشتم دەستم کرد بە نەمام ناشتن.. لەماوەی سێ ساڵدا دە هەزار نەمامم لەو باخەدا ناشت. وازم لە

هەموو شتێك هێنا خەریكی نەمام ناشتن بووم، -سبحان الله- ڕۆژ ماندوو، شەو بە جەستەی شەكەتەوە دەچوومە سەر جێگا و بەیانی بە لەشێكی ئاسودەوە هەڵدەستام، لەبیرم چووبوەوە كە من كۆمەڵێك نەخۆشیم هەیە.. جاران بەردەوام حەبم دەخوارد، بەردەوام پشكنینی تایبەتیم بۆ دەكرا، بە ماندوویەتی و باخ دروست كردن و نەمام ئاودان و تەڕ و تازە میوە خواردن و سەوزەی پاك و خاوێن و هەوای پاك و خاوێن..

كاتێكم زانی ڕۆژێك چوومە شار فەحسێكی چاوم بكەم، كە دەبوو نەشتەرگەری بۆ بكرایە، وتیان ئاوی سپی چاوت نەماوە! میزم دەگیرا پرۆستاتم نەمابوو، شەكرەم بەرز بوو، زۆر دابەزیبوو! سیەكانم كە دایمە دەكزانەوە و ئینتیهابی درێژ خایەنی هەبوو، وەختێ فەحسم كرد سیەكانم وەك گەنجێتی پاك بوونەوەو هیچم نەماوە!

دەڵێت: ئەنجا من هەستم كرد بەختەوەری خۆمم دۆزیەوە، لاشەیەكی تەندروست، دڵێكی خۆش، چونكە گەڕامەوە بۆ ئەصڵی مرۆڤایەتی، هەموو ئەو ئامێرانەی كە من شانازیم پێوە دەكردن و كە بە بوونی خۆمم دەزانین، هەموویان مایەی سەرقاڵی بوون بۆم، گەڕامەوە بۆ ژیان و وەكو شوكرانە بژێری خواش بۆ شەهادەكەم، خەستەخانەیەكی بچكۆلەم هەر لەو دوو هێكتار زەویەدا كردەوە، كە مانگانە یەك دوو عەمەلیاتێك بە بەلاش و خێرەومەندانە و ئینسانیانە بكەم بۆ ئەو كەسانەی كە پارەیان نیە. دەڵێت: كە ئەوەم كرد، ئەوەندەی تریش دڵخۆش بووم!

بۆیە زۆربەی خەڵكی ئێستا خەڵكی ئێمە دەیبینی هەم دڵی ناڕەحەتە، وەكو ئەو دكتۆرە، هەم تەندروستی تەواو نیە، هی ئەوەیە وا دەزانرێت كەسایەتی

بەستراوەتەوە بەهەندێ شتی ماددیەوە، بەلأم ژیان بریتی نیە لە ماددە، بریتیە لە تێگەیشتن لە ژیان.

تێگەیشتنیش لە ژیان سێ شتە: یەکەم: خوا ناسین، دووەم: قەناعەت کردن بەو بەشەی خوا پێی داویت، سێهەمیان: کار کردن نەك تەمەڵی، نەك هەر پارە وەرگرتن و خواردن و خەوتن، بەڵکو کارکردن و ئاوەدان کردنەوەی سەرزەوی.

کەسایەتی ئینسان گەلێك گەورەیە، شەخسیەت وەکو شوشە وایە، ئەگەر شکا یەك ناگرێتەوە. یان دەتوانم بڵێم وەك دڵۆپێك ئاو وایە شەخسیەتی ئینسان، دڵۆپە ئاوێکە یەخوا نەڕژێت.

## بەنەمانی شەرم کەسایەتی لەدەستدا !

ئەم بەسەرهاتە لە کتێبەکانی مێژوودا نوسراوە، لە ساڵی ١٩١٢دا ڕوویداوە، بەرپرسێکی دەزگای پۆلیس‌و ئاسایشی ئەو سەردەمە لە یەکێك لە یادەوەریەکانیدا نوسیویەتی، دەڵێت: شەوێك لەگەڵ کاربەدەستانی شوێنەکەدا بە شاردا دەگەڕام، لە شاری ئەستەمبوڵدا لە تورکیا دەگەڕام، بۆ ئەوەی وەزع و حاڵی میللەت بەسەر بکەمەوە، وە ئەمنی شار بپارێزم، لە پەنایماڵێکدا دەنگێك سەعات یانزە بۆ دوانزەی شەوبوو، زۆر سەرنجی ڕاکێشام، دەنگی دایکێك بوو، کە لایلایەی بۆ منداڵەکەی دەکرد، زۆر بە غوربەتەوە دەیوت فرمێسك بە چاومدا هاتە خوارەوە، زۆر غەریب بوو.

ماڵەکەم دەستنیشان کرد و ئاماژەم کرد بۆ کاربەدەستانی پۆلیس کە بەیانی ئەو شوێنە بزانن ماڵی کێیە و ژن و پیاوی ئەو ماڵەم بۆ بانگ بکەن. ئەڵێ کە

بەیانی چوون، تەنها ئافرەتێك هات، وتم ئەی پیاوەکەت؟! وتی: مێردەکەم نەماوە، وتم چەند منداڵت هەیە؟!

وتی: تەنها یەك منداڵی کوڕیەم هەیەو منداڵەکەشم زۆر خۆشدەوێت.

وتم: من ئەمشەو بەوێدا تەقدیری خوایی تێپەڕیم و گوێم لە دەنگی عەجیبی تۆ بوو، بەڕاستی تۆ وەکو خوشکم وایت، دەنگێکی گەلێك غەریب و عەجیبت هەبوو، تکات لێدەکەم ئەو لایلایەم بۆ دووبارە بکەوە من تۆماری دەکەم، وتی: ناتوانم، من ناتوانم لەبەردەم پیاوی بێگانەدا دەنگ بەرز بکەمەوە، زۆرم لەگەڵ کردو نەیبیست!

ئەڵێ دوای پێم وت دوو لیرەت دەدەمێ، کە دیارە تۆ ئافرەتێکی منداڵێکی بێ باوکت هەیە، وە خانووەکەشت دیارە دەست کورتی و هەژاریتان پێوە دیارە، دوولیرەی ئاڵتونی عوسمانیت دەدەمێ..

وتی: ناتوانم، وتم: بۆت دەکەم بە چوار لیرە..

وتی: هەر ناتوانم، وتم: شەش لیرەت دەدەمێ، وەکو ئێستا شەش وەرەقە بدەیت بە یەکێك لە مەسافەی پێنج دەقیقەدا بڵێی لایلایەیەکم بۆ بکە..

وتی: دڵنیابە ناتوانم، وتم پەردەت بۆ دەگرینەوە بڕۆ ئەو دیو پەردەکەو چیتر ئینکاریم لەگەڵدا مەکە، من ئەو دەنگە زۆر موعجیبم پێی و پێی سەرسامم، ئەمەوێت دەنگەکەت تۆمار بکەم.

ئەڵێ کە بیری لە پارە زۆرەکە کردەوە، شەش لیرەوە پەردەش دادرایەوە، بەڵام پەردەکە وام دانا کە قاچ و قولی بەدەرەوە بێت، وتم پەردەیەکی بەرزی بۆ بگرنەوە، بەڵام ئەو ئێمە نەبینێت، خستیانە ئەو دیو پەردەوە و دەستی کرد بە لایلایە، وەکو ئەوەی شەو وتی، زۆر هەموو پێی سەرسام بووین، هاتە دەرەوە..

بەلأم لەو کاتەدا دەلێت بە هاورێکانم وت کەوا لەگەڵمدا بوون، وتم: سەیری قاچو قولی ئەو ئافرەتە بکەن، چۆن دلۆپ دلۆپ عارەقە دێتە خوارەوە، کە هاتەوە ئەمدیو پەردە، هەرچی لەشی بوو لە عارەق هەڵکشابوو! لەگەڵ ئەوەدا سەرمای زستانی ئەستەمبولیش بوو، بە دەستە سڕێکیش دەمو چاوی خۆی پێ سڕیەوە، هەموو لەشی ئەلەرزی، پارەکەی وەرگرت و ڕۆیشت!

سێ چوار ڕۆژێکی پێچوو لە دەرگا درا، کە دەرگا کرایەوە هەمان ئەو ئافرەتە بوو، وتی هاتوومەتەوە جارێکی کە لایلایەکەتان بۆ دووبارە بکەمەوە!

ئەڵێ کە هاتەوە خۆی داوای کرد، وتم: فەرموو، وتی: ئەم جارە چەندم بەخشیش دەدەیتێ؟!

وتم: چەند باشە؟! وتی: وەکو جاران شەش لیرە، یان زیاتر..

وتم: نا زۆرە، وتی چوار لیرە؟! وتم: زۆرە، وتی: دوو، وتم: زۆرە، وتی: یەك لیرەشم بدەیتێ هەر دەیلێم.

وتم: هیچ نادەم، وتی: دەی باشە با ڕێگاکە بەفیڕۆ نەڕوات، هاتووم لایلایەکە هەر پێشکەش دەکەم، ئەمجارە پەردەش دانەدرایەوە، هەر لەبەر چاوی هەمووومان لایلایەکەی وت، بەلأم نە عارەقی کردەوە، نە لەرزی، نە شەرمیشی کرد، ڕۆیشتو هیچ پارەم نەدایە. دوو سێ جاری تر هاتەوە، وتم خوشکی من، من یەك جار ئیشم بەو کارەی تۆ بوو، ئیتر جارێکی دیکە بۆ ئێرە بێیتەوە سزات دەدەم، تۆ ئافرەتێکی پێویستە لە ماڵ و حاڵی خۆتدا بە حورمەتەوە دابنیشی. هاورێکانم لێیان پرسیم، شتێکی غەریب و عەجیب بوو، تۆ ئەم کارەت بەم ئافرەتە کرد، وتم: ئەوە دەرسێکە بۆ ئێوەش، بۆ خۆمان، بۆ ماڵ و منداڵمان، ئەوە حەیا و حورمەت بوو.

یەکەمجار لەو دیو پەردەشەوە چۆن عارەق دەهاتە خوارەوە، ئەوە شەخسیەتی ئینسانە، بە چەند دڵۆپە عارەقێك و لەرزینێك دەڕوات، بەس جاری یەکەمی زەحمەتە، جاری دووەم پەردەشی ناوێت.

ئەوە بەسەرهاتێکی واقعیە و دەرسە بۆ هەموومان، بۆ ژنان و بۆ پیاوان، بۆ کوڕان و بۆ کچان، بەس وریای خۆت بە، یەك جار قاچت نەخلیسکێت بە ڕەفتاری دزێو ناشرین.

ئەو خوشکانەی کە جلو بەرگی تەسكو کورت ناشەرعی دەپۆشنو ئەندامەکانی لاشەیان دیارە، ئەوە یەك جاری زەحمەت بووە. جاری یەکەمیان زۆر ناڕەحەت بووە، جاری دووەمیان تازە بە خەیاڵیدا نایەت. ئاگات لێی بێت قاچت نەترازێت، ئەو گەنجەی یەکەمجار دەست بۆ عارەقێك دەبات، بەس جاری یەکەمی زەحمەتە، جاری دووەم شانازیشی پێوە دەکات، ئەو بەسەریەوە دەنێت و هەموو خەڵکیش سەیری دەکات و تەلەفزیۆنیش تەصویری دەکات! لەو سەر جادە دەیخواتەوە. تۆی مسوڵمان پێت عەیبە سەیری شوشەکەیشی بکەیت لە ڕێگادا، پێت عەیبە قاچی لێبدەیت.

کەچی ئەو کەسەی کە دەچێتە لای کاربەدەستێك، هەر یەکەمجار ڕێزت هەیە، ئەوەی کە دەچێتە بارەگا حیزبیەکان کە ئیشی ئەوێی نیە، دەرت دەکەن، یەکەمجار پارەت دەداتێ جاسوسی بکەیت، دووەم جار بە بەلاشیش بیکەیت ڕێزت لێناگرێت.



## پەروەردەی منداڵ بنەمای کەسێتیە

پێویستە لەسەر هەموو دایکو باوکێك ئاگاداری پەروەردەی منداڵەکەی بێت، لەماڵەوەو لەخوێندنگاو لای هاورێکانی، چونکە پێش بونی منداڵ هەموو دایکو باوکێك ئاواتەخوازە خودا منداڵێکی ساغو باشیان بداتێ، کەئەمەش نیعمەتێکە هەموو کەسێ هەستی پێناکات ئەوانە نەبێ کەمنداڵیان نیە یان خودا نەیداوە پێیان، هەموو هەوڵێك ئەدەن: رێگەی پزیشکیو پەنا بردن بۆ دوعاکردنو خێرکردنو.. تا خودا منداڵێکیان پێ ئەبەخشێ..

بەڵام تەنها بەخێوی دەکەن، زۆرکردنی منداڵو گەورەکردن بەداخەوە پەروەردەیان بیر دەچێ، کە بنەمای شەخسیەتەو پێویستیەکی شەرعیو ئینسانیە لەسەر هەموو دایکو باوکێك.. کەلەم سەردەمەی خۆماندا چەندین هۆکار هەیە بۆ بەلارێبردنی هەڵسوکەوتی منداڵ، هەر لە تەکنەلۆجیاو هاورێو راگەیاندنو ناوەندی کات بەسەر بردنو..

بۆیە ئێمە دەبێت هەرلەسەرەتای لەدایك بونەوە خەمخۆر بین بۆ منداڵەکانمانو، ئاگادارو فێرکاری هەموو ئادابو رەوشتێکی جوان بین بۆی دواتر فێری دینداری عیبادەت بکرێ، هەموو شتەکانی بکرێتە بەرنامەو بەکاتو مەرج مامەڵەی لەگەڵ بکرێ، رێگە نەدرێ بۆ هەموو شوێنێك بچێ تاکاتێکی نادیاریش مەهێڵە بمێنێـەوە یان برِوات.. چونکە هەموو ئەوانەی قومارکەرو عارەق خۆرو تلیك کێشو فێری شتی خراپ بوون لەگەورەبیدا، هی بێئاگایی دایکو باوکە لەمنداڵیدا.. بۆیە واباشە لەسەر بنەمای کەسێکی سود بەخش بۆ هەموو کۆمەڵگە

پەروەردە بکرێ، بۆیە بچوکترین هەڵەو بێئاگای لەپەروەردە گەورەترین کاریگەری خراپ دروست دەکات بۆ پاشەڕۆژی.

## بەیەك شەو منداڵەکەم گۆڕا !

لە کتێبی: (ئەسرینەکانی سەدەی بیستەمدا) بەسەرهاتێك نوسراوەتەوە، باسی ئەوە دەکات پیاوێکی دوکاندار خاوەنی یەك منداڵی تەمەن پێنج ساڵ دەبێت، زۆر ڕەوشت جوانو بە ئەدەب، منداڵی واهەیە ئەڵێی گەورەیە ڕەفتار دەکات، کە دەچێت سەلام دەکات، لەبەرت هەڵدەستێت، خزمەتی دایك و باوك دەکات! منداڵە بەڵام عەقڵی گەورەیە. ئەم باوکە دەڵێت ئاوا پێم گەیاند. ڕۆژێکیان لەگەڵ خۆی دەیبات کە لە بازاڕ جل و بەرگی بۆ بکڕێت، ئەڵێ خۆم دوکاندار بووم، قەدەری خوای پەروەردگار موشتەریەکی زۆر ڕووی تێکردم، لەو کاتەدا کە موشتەریەکانم دەهاتن لەگەڵ بەڕێ کردنی ئەواندا خەریك بووم، کە چاوم لەسەری لاچوو منداڵکە نەمابوو!

گەڕام ئەم دراوسێ دوکان، ئەو دراوسێ دوکان.. منداڵ دیار نەما! بە پەلە دوکانم قەپات کرد و ڕۆیشتم بەدوی منداڵدا، ئەو گوزەرەی دوکانی خۆمان گەڕام منداڵ نەبوو! لە بڵندگۆی مزگەوتێکەوە بانگەوازم کرد لەو نزیکانە، هەر کەسێك منداڵێك بەو ناوە و بەو جل و بەرگەوە بیدۆزێتەوە خەڵاتی سەد دۆلاری دەدەمێ بەس بۆم بێنێتەوە، سەد دۆلار خەڵاتیەتی، ئەڵێ کەس نەبوو. شەو چوومەوە گەلێك نارەحەت بووم، لەوەش نەدەترسام منداڵەکەم کەس بیفرێنێت و بە پارە

پێم بفرۆشێتەوە، چونکە خراپەیەکم بۆ کەس نەبوو، ئەوەندەش دەوڵەمەندێکی سامانداری نەبووم.

بۆ بەیانی ئەڵێ لە دوکانەکەمدا غەمگین دانیشتبووم، پیاوێك هات بۆلام، جا ئەو پیاوەی دووەمیشیان کە منداڵەکەی دۆزیەوە دەڵێت: ویستم بیبەمەوە، کە وترا سەد دۆلار بۆ هەر کەسێك کە ئەم منداڵە بێنێتەوە، وتم: باوکی تێن بەجەرگی گەیشتووە، ماوەیەکی کە خۆت ڕابگرە، خەڵاتەکە دەکات بە دووسەد دۆلار، ئەمشەو نەچێتەوە بەیانی پێنجسەد دۆلاریش دەدات. منداڵم گرت و بردمەوە بۆ ماڵی خۆمان، بەڵام بۆ بەیانی هاتمەوە گوێم هەڵخست هیچ کەس باسی منداڵ ناکات، نە بانگەواز ماوە و نە کەس مەشغوڵە!

کابرا لە دوکانی خۆیدا بۆخۆی مەلول دانیشتووە، سڵاوم لێکرد و چووم بۆ لای و خوا بازاڕیم لێکرد، وتم: جەنابت منداڵت لێ بزر بووبوو؟!

وتی: بەڵێ، وتم: نەتدۆزیەوە؟! وتی: نەوەڵا، وتم: دوێنێ گوێ بیستبووم سەد دۆلارت داوە بۆ هەر کەسێك کە ئەم منداڵەت بۆ بینێتەوە، وتی: بەڵێ، وتم دیارە ئەم منداڵە نەدۆزراوەتەوە، خەڵاتیش زیادی کردووە؟!

وتی: نەوەڵا، ئەمڕۆ هیچ نادەم !! وتم: سەیرە، تۆ دوێنێ سەد دۆلارت دەدا، ئەمڕۆ هیچ نادەیت؟!

وتی: من مەبەستم منداڵەکە نەبوو، مەبەستم خوڕەوشتی منداڵەکە بوو، من ویستم منداڵەکەم شەوێك لە ماڵان نەمێنێتەوە، کەوچکی ماڵانی بە دەمدا نەچێت، جوێنی منداڵان فێرنەبێت، بۆیە ویستم وا بە پەلە بگەڕێتەوە بۆ ئامێزم، بەڵام ئەمشەو لەدەستم چوو، لە هەر شوێنێکدا بێت کۆمەڵێك تەربیەتی وەرگرت کە جیاوازە لە تەربیەتی ماڵەکەی خۆم، ئیتر هەر کەسێك گلی دابێتەوە لای خۆی لە

ڕووی یاساییەوە تاوانبارە، وە جەنابیشت کە منداڵەکەمت لایە، سەری خۆت مەئێشێنە و منداڵەکەم بۆ بێنەوە، چونکە کەسی تر لە بەیانیەوە لێی نەپرسیوم، من پەروەردەی منداڵەکەم بە لاوە گرنگ بوو، پێم خۆش بوو بفەوتێت، بەلاّم ئەخلاقی لەدەست نەدات.

ئەڵێ: -سبحان الله- هێنایەوە شەو لەگەڵ منداڵی ئەو ماڵانە یاری کردبوو، ئەو پیاوە دەڵێت: بوو بە شەش ساڵ ڕەفتاری ئەو شەوەم پێ تەرك نەدەکرا کە لەگەڵ ئەو منداڵانە فێری بوو بوو!

## پیغەمبەر ﷺ لەشتە بچوکەکانیشدا فێری کردوین

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر ئاگای لەم ئومەتە بووە کە شەخسیەتی پارێزراو بێت، تەنانەت لە شتە بچوکەکاندا، هەر شتێك سەرنجی خەڵکی ڕاکێشاو ئاوڕی بۆ دایەوەو بە چاوێکی سووك سەیری کردی، پێغەمبەری خوا فەرموویەتی خۆتی لێ بپارێزە. -سبحان الله- تەنانەت باوێشك دان‌و، پژمین!

لە فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەردا ﷺ کە ئەبو هریرە بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: (**كانَ رَسولُ اللهِ إذا عَطَسَ وَضَعَ يَدَهُ أو ثَوبَهُ عَلى أنفِهِ وَ خَفَضَ فيها صَوتَهُ**)، وەلاّمی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی بەکردەوە نیشانی داین و فێری کردین کاتێك کە دەپژمین، دەستمان یان دەستە سرێك، پارچە قوماشێك بگرین بە دەم و لوتمانەوە، نافەرمووێت: کونە لوتت قەپات بکە با مێشکت نەتەقێت، نەخێر. بەلاّم دەم و لوتت بگرە، فەرمووی با ئەو دەنگە بەسەر خەڵکدا جێبەجێ نەبێت، هی واهەیە لە مزگەوتێکدا دەپژمێت، هەمووی پێی دەزانێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (إِذا تَثائَبَ أَحَدُكمْ فَليُرَدَّهُ) ئەگەر باوێشك زۆری بۆ یەکێکتان هێنا هەتا دەتوانی مەهێڵە باوێشکەکە دەمت مەکەوە، باوێشکەکە قوت بدەوە، (فَإِنْ أَحَدُكُمْ إِذا تَثائَبَ فَضَحِكَ مِنْهُ الشَیطانُ) چونکە هەر یەکێك لە ئێوە کاتێك باوێشك دەدات و دەم دەکاتەوە، ها ها دەکات، فەرمووی شەیتان پێی پێدەکەنێت! واتە شەخسیەتی لەکەدار دەبێت.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بیخۆوە دەمت مەکەوە، وە ئەگەر هەر هاتەوە ناچار بویت، فەرمووی: ئەگەر بە دەستی ڕاستت بوو لەپی دەستت، ئەگەر بە دەستی چەپت بوو پشتە دەستت بخەرە سەر دەمت، با ئەوەی بەرامبەرت کاریگەری خراپی تێنەکات، چونکە ئەوە لە ڕووی سایکۆلۆژیشەوە سەلماوە کەسێك بەرامبەری باوێشك بدەیت یەکسەر کاریگەری دروست دەکات ئەویش باوێشك دەدات، وە چەند ناشرینە یەکجار چاوت لە خۆت بێت کە باوێشك دەدەیت، دەمت کراوەیە، چەند دیمەنێکی ناشرینە! چۆن ئەو دەنگ بەرزکردنەوەیە لە شەخسیەتت کەم دەکاتەوە.

### ئادابی خواردن

مسوڵمان لە پێغەمبەرە ئازیزەکەیەوە ﷺ فێر دەبێت، پێغەمبەری خوا عادەتی وابوو کەسی تەریق نەدەکردەوە، بەڵام کەسێك کارێکی بکردایە، شەخسیەتی پێی بشکایە، پێغەمبەری خوا ئاگاداری دەکردەوە، نەسیحەتی دەکرد، ئاگات لەخۆت بێت، ئائەم کارە پێی سووك دەبیت، یەکێك لەوانە عومەری کوڕی سەلەمەیە، دەفەرمووێت: منداڵێکی تازە پێگەشتووبووم، ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ لەماڵمان بوو، من لەگەڵ پێغەمبەری خوادا حەزم کرد نان

بخۆم لەو قاپەی ئەودا نانم دەخوارد، ئەفەرموویت: بە هەموو لایەکدا دەستم دەخستە ناو خواردنەکەوە و مشو هورِ..

پێغەمبەری خواﷺ رِێك مەچەکی گرتم فەرمووی: بوەستە! - پێغەمبەر کەسی تەریق نەدەکردەوەو صەحابەکانی رِوشکێن نەدەکرد، کەسێ رِەفتارێکی دزێوی کردبێ کەکاری کردبێت سەر کەسایەتی تەریقی دەکردەوە، بۆ ئەوەی دووبارەی نەکاتەوە، بەلاّم ئەم منداڵە با لە ئێستاوە فێری ئەوە نەبێت بۆ پارچەیەك نانو گۆشت، شەخسیەتی خۆی برِوخێنێت.

پێغەمبەر رِێك مەچەکی گرتم، فەرمووی: (**یا غُلام**) کورِی گەنج، وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: (**سَمِ الله**)، ناوی خوا بهێنە، (**وَ كُلْ بِيَمينِكَ**) بە دەستی رِاستت بخۆ، (**وَ كُلْ مما يَلِيكَ**) ئەها سێ وشە، سێ دەرس: بسم الله بکە، بە دەستی رِاستت بخۆ، لەبەردەمی خۆتەوە بخۆ. دەست مەگێرِە بە هەموو قاپەکەدا، ئەم دیو ئەودیوی بکەیت، فەرمووی بە هێواشی بخۆ، پاروەکەت جوان بجو، لەبەردەمی خۆتەوە بخۆ، چاو مەگێرِە بۆ بەردەمی بەرامبەرت، دەمی بەرامبەرت. بە دوو سێ وشە.

ئەم گەنجە گەورە بوو، دوایی بۆ ئیمامی (بوخاری و مسلیم)ی دەگێرِێتەوە، ئەفەرموویت: پێغەمبەری خوا ئەو ئامۆژگاریەی کردم، قەت لەیادم نەکرد.



## بەزۆر وەدووی خەڵکی مەکەوە

پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵانی قەت ڕووشکێن نەکردووە، بەڵام کەسێك ڕەفتارێکی دزێوی کردبێت کە کاری کردبێتە سەر شەخسیەت و کەسایەتی تەریقی کردوەتەوە، بۆ ئەوەی لێی ببێتە دەرس و دووبارەی نەکاتەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێك دێ بۆ لای و عەرزی دەکات: ئەی پێغەمبەری خوا خۆشەویستم، نووری چاوم، دڵم مەشکێنە وەرە بۆ ماڵم و بۆ بەرەکەت پارویەك نان لە ماڵم بخۆ، بەڵام خۆت و چوار کەس، من تەنها جێگای پێنج کەسم هەیەو نانی پێنج کەسم پێدەدرێت، (واتە دروستە هیچ عەیبە نیە کەسێك میوانداری کەسێك دەکات، بڵێ ئەوەندە کەسە زیاتر نەبن، من ئەوەندەم جێگا هەیەو خزمەتم بۆ دەکرێت).

پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆی کرد لە  مزگەوتا و چوار لە هاوەڵانی پێشتر ئاگاداری کردبوون کە نیوەڕۆ لە ماڵی فلان کەسین با بڕۆین، ڕۆیشتن..

پیاوێك بە شوێنیان کەوت خۆی تێهەڵکێش کرد بە بێ ئەوەی کەس پێی بڵێت، بە بێ ئەوەی پێغەمبەری خوا بفەرمووێت بڕۆ، گەیشتنە بەر دەرگا، بوو بوون بە شەش..

پێغەمبەری خوا ﷺ لە دەرگای دا، کابرا فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا تەشریف بێنەرە ژوورەوە ماڵی جەنابتە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (إِنَّ هذا تَبِعَنا). ئەم پیاوە شوێنمان کەوتووە، دەعوەت نەکرابوو، خۆی تێهەڵکێش کردووین. –ئەمەتەریق کردنەوەیە، وەستاندنە، ئیش لەسەر کردنە– (فَإِنْ شِئتَ اَنْ تَأْذَنَ لَهُ) ئەگەر

ئیزنی بدەیت ماڵت، ئاوا بێت نەوەك برسیەتی پاڵی پێوە نابێت (وَ إِنْ شِئتَ رَجَعَ) قبوڵیشت نەبێ ئەبێت بگەڕێتەوە، خەتا لە خۆیەوەیەتی تۆ هیچ تەریق مەبەوە، خەتا لە تۆی خاوەن ماڵەوە نیە.

کابرای خاوەن ماڵ فەرمووی: (بَل آذَنُ لَهُ یا رِسول الله) ئەی پێغەمبەری خوا ئیزن دراوە، لە خزمەتیام و ئەویش لەسەر چاوانم وەکو جەنابتان با بێتە ژوورەوە..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەمجا وەرە ژوورەوە، بەڵام جارێکی دیکە وامەکە.

کەواتە: قەت خۆتێهەڵکێش مەبە، شەخسیەتی خۆت مەشکێنە کۆمەڵە خەڵکێك دەعوەت کراون با بە تۆش بڵێن فەرموو ئەو کات بڕۆ.. گەر ئەو کەسە مەبەستی بێت پێشتر ئاگادارت دەکاتەوە..

کۆمەڵە خەڵکێك دەچن بۆ ماڵێك، بۆلای نەخۆشێك، بۆ سەردانێك، ئەگەر بە تۆشیان نەوتبوو پێشتر خۆ تێهەڵکێش مەکە، بۆ لای بەرپرسێکی حیزبی دەچن، بۆ بنکەیەك دەچن، کەس بە تۆی نەوتووە، مەڵێ با منیش بێم بزانم چ باسە؟!

## بۆ هەموو فەرموویەك بەڵێ مەکە

خۆ تێهەڵکێش مەبە بە چاوی سووك سەیر دەکرێیت، هەر بە فەرموویەك تۆش مەڵێ فەرموو!

ئەمڕۆ دیاردەیەکی گەلێك ناشرین هەیە، کەسێك لە سەیارەدایە، بە پاس دەڕوات بۆ ئەوەی پارەی زیاتر نەدات بە سەیارەی تایبەت، دوو نەفەر فەرمووی دەکات بۆ پارە دان ناسیاویەتی، دراوسێیەتی، خزمیەتی، یەکسەر نابێ بڵێ ماڵت

ئاوا بێت.. کابرا لە جیاتی نەفەرێك پارەی سێ نەفەر بدات! بۆ نمونە: من(نوسەر) جارێکیان لە تەکسیەکدا بوم بە چاوی خۆم ئەوەم بینی، ئەو سەیارەیە سێ نەفەریان برادەری خاوەن تەکسیەکە بوون، لەبەر ڕێزی مەلایەتی وتیان مامۆستا تۆ لە پێشەوە دانیشە، ئەوان هەرسێکیان لە دواوە بوون، کە پارە کۆکرایەوە کابرا ئەوەندە وتی: کاکە با لەسەر خۆم بێت..

وتیان: دەی ماڵت ئاوا بێت! تەنانەت کابرای شۆفێر هەستم کردو لە دەم و چاویدا غەریبیەکم خوێندەوە، وتی تو خوا مامۆستا دەتۆش لێی گەڕێ! واتە با هەر بە بەلاش بڕۆم. ئەمە کارێکی باش نیە کابرا سەیارەیەك لەوانەیە هی دوو خێزان بێت، با حورمەتیشت بگرێت، بڵێ: کاکە خوای گەورە ڕزقت بدات، بەڵام ئەمە کەسابەتە، بەڵام کە لەو سەر جادە توشت بووم لەوانەیە بڵێم بمگەیەنەرە ئەوسەری شارو هیچ پارەشت داوا نەکەیتو تۆش چاوت لێی نەبێت..

یان کابرا دوکاندارە با بڵێ لەسەر خۆیشم بێت، یەکسەر مەڵێ قوربان بەزیاد بێتو، بیخەیتەوە ناو گیرفانتەوە، چونکە ئەمە شوێنی کەسابەتە، ئێمە دەبێ ئاگامان لەوە بێت.

یان هەر شتێکی دیکە کەدەیبینین بەلامانەوە جوانە، یان پێمان دەڵێن پیرۆزت بێت یان بۆ خۆت، وەك مۆبایلێك، کتێبێك، تەسبیحێك، جلو بەرگێك.. هەرچەندە ئەمانە لەڕووی مادیەوە بەهاکەشیان زۆر نەبێت بەڵام لای خاوەنیان خۆشەویستە، نابێ یەکسەر قبوڵ بکرێت چونکە ئەگەر مەبەستی بێت خۆی بە دیاری بۆت دێنێت، ئەو فەرمووە قبوڵ مەکە، چونکە وات لێدێت خەڵك بە شەخسیەتت لەکەدار دەبێت، خەڵك لە خۆیەوە لێت دەترسێت، خەڵك بە کەسێکی سووك تەماشات دەکات.

## بەبێ ڕوخسەت مەچۆرە ماڵان

کێشەیەکی دیکە لە کۆمەڵگای ئێمەدا هەیەو پێشتریش لەناو کۆمەڵگەکانی تردا هەبووە، وەك لە قورئاندا هاتووەو ڕاڤەکارانی قورئان لەتەفسیرەکانیاندا ئاماژەیان پێ کردوە، ئەویش چونە ماڵانە بە بێ ڕوخسەتو بە بێ لە دەرگادانو ئاگادار کردن. ئەمەش پێچەوانەی ئادابو شەرعە، هەندێ جار سەیر دەکەیت کەسەکە لە پشت پەنجەرەیەکەوە وەستاوە سەیری ژوورەوە دەکات! لەم کاتەدا سودی ئاگادار کردنەوەو لەدەرگادان نامێنێ.. هەندێ کات ڕەچاوی کاتی هاتن ناکرێ، ئەو ماڵە پشوو دەدەنو کاتی نان خواردنە یان کات درەنگەو ڕوخسەت وەرگرتن نەماوە.. بۆیە دەبێ لەگەڵ سەردەمدا ئێمەش پێش بکەوین، بەتایبەت پێش کەوتنی هۆکاری پەیوەندی ئەمەی بۆ ئاسان کردوین ئەمڕۆ موبایل هەیە، پێویستە ڕوخسەتێك وەربگریت پێش چونەکەت..

**یەکەم: لە قورئاندا**

خوای گەورە ئەم بابەتەی لە قورئاندا باس کردووەو دەفەرموێت:

بۆ ئەوەی کۆمەڵو کۆمەڵگە بەپاکی بمێنێتەوەو نەتوانن بوختان بۆ یەکتری بکەن، بەرنامەی سەردانو زیارەتی یەکتری دادەنێت، بۆیە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ بُيُوتِكُمۡ﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جگە لەماڵی خۆتان مەچنە هیچ ماڵێکی تر، ﴿حَتَّىٰ تَسۡتَأۡنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهۡلِهَا﴾ تا مۆڵەت دەخوازنو سڵاو لەدانیشتوانو خاوەن ماڵەکان دەکەن:﴿ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ﴾

ئائەوە بۆ ئێوە چاکترە، تا بەبێ مۆڵەت خۆتان بکەن بەژووردا، ﴿لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ بەشکو لەو شێوەیە پەندو ئامۆژگاری وەربگرنو کاری پێ بکەن..

پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئایا دەبێ لەدایکیشم مۆڵەت وەربگرم؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ، کابرا وتی: ئاخر جگە لەمن کەسێکی دیکەی نیە خزمەتی بکات.

پەیامبەریش ﷺ فەرمووی: باشە پێت خۆشە دایکت بەڕووتی ببینیت؟ کابرا وتی: نا، ئەویش فەرمووی: کەواتە هەرکاتێك دەتەوێ بچیتە ژوورەکەیەوە ئاگاداری بکە ئەوجا بچۆ ژوورەوە (ئیمامی بەیهەقیو تەبەری) ڕیوایەتیان کردووە.

﴿فَإِن لَّمْ تَجِدُواْ فِيهَآ أَحَدًا﴾ ئینجا ئەگەر کەسێتان لەوماڵدا دەست نەکەوت مۆڵەتتان بدات، یان زانیتان کەس لەو ماڵەدا نیە: ﴿فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤْذَنَ لَكُمْ﴾ مەچنە ژوورەوە تا مۆڵەتتان ئەدرێ لەلایەن کەسێکەوە ئیزنی بەدەست بێت، چونکە خانووبەرە ڕێزو حورمەتێکی تایبەتی خۆی هەیە هیچ کەسێك بۆی نیە حورمەتی بشکێنێ..

﴿وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرْجِعُواْ فَٱرْجِعُواْ ۖ هُوَ أَزْكَىٰ لَكُمْ ۚ﴾ خۆ ئەگەر پێشتان وترا بگەڕێنەوە، ئێوەش بەبێ دلگرانیو ناڕەحەتی بگەڕێنەوە ئەوەش بۆ ئێوە باشترو چاکترە، ئەوە شەخسیەتتان پێی بەرز دەبێتەوە، پێی گەورە دەبن. بەلاتانەوە ئاسایی بێو کابرای خاوەن ماڵیش تاوانبار مەکە بلێی تا ماوم چاوم بە ماڵی ناکەوێتەوە.. نا وا مەڵێ، چونکە ئەو کەسەش ئینسانە، لەوانەیە ماندوو بێت، هی

واهەیە میوانی هاتووە وتوویەتی ترساوم قسە ببزڕکێنم، ڕۆژ ئەوەندە ماندوو بووم، کابراش تێر خەو بووە، شەو هاتووە هەتا نیوە شەو، من لەوە ترساوم قسەکان تێکەڵ و پێکەڵ بکەم! یان ژنی ماڵەکە وتی داوای لێبوردن دەکەم کاتم نیە میوان ڕاگرمو بتبینم، نەخۆشم، ماندووم، منداڵم نەخۆشە، منداڵم سەعی هەیە، میوانی ترم دێت، هەر شتێکی پێ وتی بگەڕێوە.

دووەم لەسوننەتدا:

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم کەسانەی تەریق کردۆتەوە کە ئەم کارانەیان کردووە، با ببێتە دەرس و عیبرەت بۆی، عەیبە نیە.. با لەم فەرمودەیەدا ئەمە ڕوون بکەینەوە کە بوخاری و موسلیم لە حەدیسی (متفق علیه)دا ڕیوایەتیان کردووە: ئەم پیاوەی ڕیوایەتی کردوە ناوی (کلدەی کوڕی حەنبەلە) دەفەرمووێت: چوومە ماڵی پێغەمبەری ﷺ بەبێ لە دەرگادان، بە بێ کۆکە کردنێك، بە بێ هەست و خوستێك، کە چوومە ژوورەوە پێغەمبەری خوا لەگەڵ خاتوو عائیشە ڕاکشابوو، کەئەمەش ماڵی خۆیەتیو ئازادە..

دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا ﷺ کە کەسی تەریق نەدەکردەوە، بەڵام لەم حاڵەتە توڕە بوو، فەرمووی (إِرْجِعْ) بگەڕێوە، بڕۆوە دەرەوە، بڕۆوە قاپیەکەی دەرەوەی ماڵ..

(فَقول السَلامُ عَلَيْكُم) دەنگ هەڵبڕە، بڵێ سەلامی خواتان لەسەر بێت ماڵەکە، (أَأَدْخُلُ) ئەرێ ڕوخسەت هەیە بێمە ژوورەوە؟!

ئەمجا ئەگەر گوتمان فەرموو جارێکی کە وەرە ژوورەوە، پێغەمبەر کابرای گێڕایەوە، ئەیفەرموو: دە قەیناکە وەرە..

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (**الإستأذان ثلاثٌ**) لە دەرگا دانیش لەسیّ جار زیاتر حەرامە، سیّ جار وای پیا کێشە ئەگەر جەرەسی نەبوو گوێی لیّ بێت. یان سیّ جار دەستت بە جەرەسدا هێنا، کەمێك بوەستە بۆ ئەوەی کابرا لەوانەیە جلێك لەبەر بکات، لەوانەیە خۆی کۆکاتەوە، لەوانەیە ژوورەکە پەرش و بلاّو بێت، لە ماوەی ئەو سیّ دەقیقەیەدا خۆی کۆدەکاتەوە..

(**فَإنْ أذِنَ لَكَ**) ئەگەر کابرا لەو سیّ جارەدا جوابی دایتەوە، وتی: فەرموو وەرە ژوورەوە بچۆرە ژورەوە.. (**وَ إلا فَارجِع**) بەڵام ئەگەر نیکردەوە مەیکە بە چوار جار لە دەرگادان و جەرەس دان بگەڕێوە، دیارە ئەو ماڵە ئامادەیی پێشوازی میوانیان نیە.

**تێبینی:**

ئیمامی ئەحمەد –ڕەحمەتی خوای لێبێت– ئەڵیّ: ئینسان هەرکات گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆی چاك وایە لەدەم دەرگادا بکۆکیّ یان پیّ بکوتیّ بەزەویدا، هەر بۆیە پێغەمبەرﷺ ڕیّ نادات بەوانەی لەسەفەرێکی دوور دەگەڕێنەوە بیّ ئاگادار کردنەوەی ماڵ‌و منداڵ بەشەو خۆیان بکەن بەماڵدا. لەفەرمودەیەکی دیکەدا هاتووە: کاتیّ پێغەمبەرﷺ لەسەفەر دەگەڕایەوە، لەنزیك شاری مەدینەدا بارخانەیان دەخست تاکو نزیکی ئێوارە، ئەوسا ئەیفەرموو: بائەو ژنانە ئامادەنین بۆپێشوازی مێردەکانیان خۆ ئامادە بکەن‌و پاکو تەمیزی خۆیان بکەن‌و،

پرچەکانیان شانە بکەن. ( متفق علیە). خێزانی عبداللەی کوڕی مسعود ئەڵێ: هەرکات عبدالله ئەگەڕایەوە بۆ ماڵ لەدەم دەرگاکەدا ئەکۆکیو تفی ئەکردەوە تا بێئاگاداری ئێمە نەیەتە ژورەوەو شتێ ببینێ حەزی پێ نەکات.

**نمونەیەکی قورئانی لەئێستادا:**

چەند شادومان بووم برادەرێك بۆی گێڕامەوە، وتی: ماڵی برا دەرێکم بە ژن و منداڵەوە (زۆر خۆشەویست بوون لە لام) دەعوەتم کردن، ئاگادارم کردن کە سبەی ئێوارە لەماڵی ئێمەن، ئەڵێ قەدەری خوای گەورە من دوکاندار و ئەویش ئەهلی کەسابەت، کە ئێواران بە خێزانی کۆبیینەوە، لە نیوەڕۆ بە دواوە وەزعی خێزانم تێکچوو، دڵی بەیەکا دەهات، خەریکی بورانەوەبوو، وەلاهی لە ڕێگادابوون بە سەیارە بێن بۆ ماڵی ئێمە، تەلەفونم بۆ کردن وتم: کاکە تکایە بگەڕێنەوە، بەخوا ئەمڕۆ ڕۆژی میوانداریم نیە و خێزانم وەزعی تەواو نیە..

کابرا وتی: بەقەدەر نان خواردنەکە پێم خۆش بوو، کە ئایەتێکی قورئانمان جێبەجێ کرد! منیش بەو پەڕی سنگ فراوانیەوە دەگەڕێمەوە. ئەمە دەخەینە کاتێکی تر، ئاساییە.





# بەشی پێنجەم

## هەر کەس کەسایەتی بەهێز نەبێ،

## بە شاهید وەرناگیرێ

## خاڵە بنەڕەتیەکانی ئەم بەشە:

❁ قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى: ﴿فَإِن لَّمْ تَجِدُواْ فِيهَآ أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤْذَنَ لَكُمْ ۖ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرْجِعُواْ فَٱرْجِعُواْ ۖ هُوَ أَزْكَىٰ لَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨﴾﴾ النُّور: ٢٨.

✪ عَنْ كِلْدَةَ بنِ الحَنْبَلْ، قالَ: أتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فدَخَلْتُ عَلَيْهِ و لَمْ أُسَلِّمْ، فَقالَ النَبيُّ ﷺ: إِرْجِعْ، فقُل: السَّلامُ عَلَيْكُمْ، أأدْخُلُ؟!. رَواهُ أبُوداود: (٥١٧٦) وَالترمذي: (٢٧١٠) وقال: حَديثٌ حسَنٌ.

قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الإسْتِئذانُ ثَلاثٌ، فَإنْ أذِنَ لَكَ وَ إلاّ فَارْجِعْ). متفق عليه، (بُخاري: ٦٢٤٥) وَ مُسْلِمْ: (٢١٥٣).

✪ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (فَيُصْبِحُ النّاسُ يَتَبايَعُونَ، لا يَكادُ أحَدٌ يُؤَدِّي الأَمانَةَ، حَتَّى يُقالَ: إنَّ في بَني فُلانٍ رَجُلاً أميناً، حَتَّى يُقالَ لِلرَّجُلِ: ما أجْلَدَهُ، وَما أظْرَفَهُ، وَما أعْقَلَهُ، وَما في قَلْبِهِ مِثْقالُ حَبَّةِ خَرْدَلٍ مِنْ إيمانٍ) رَواهُ البُخاريُّ (٦٤٩٧) و مُسْلِم: (١٤٣).

✪ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (إذا ضُيِّعَتِ الأمانَةُ فانْتَظِرِ السّاعَةَ) قالُوا: كَيْفَ إضاعَتُها؟ قالَ: (إذا وُسِّدَ الأمْرُ إلى غَيْرِ أهْلِهِ، فَانْتَظِرِ السّاعَةَ). رواهُ البُخاريُّ: (٦٤٩٦).

✪ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (سَيَأْتي عَلى النّاسِ سَنَواتٌ، خَدّاعاتٌ يُصَدَّقُ فيها الكاذِبُ، وَ يُكَذَّبُ فيها الصّادِقُ، وَ يُؤْتَمَنُ فيها الخائِنُ، وَ يُخَوَّنُ فيها

الأَمينُ، وَ يَنْطِقُ فيها الرُّوَيْبِضَةُ) قيلَ: وَما الرُّوَيْبِضَةُ؟ قالَ: الرَّجُلُ التَّافِهُ ـ السَّفيهُ ـ يَتَكَلَّمُ فِي أَمْرِ العامَّةِ). رَواهُ أَحْمَد: (٢ / ٢٩١، ٣٣٨). وَ صَحَّحَهُ الأَلْباني في صَحيحِ الجامِع: (٣٦٥٠).

سەرچاوەکان:


١) شرح رياض الصّالِحين، إِبْنُ عُثَيْمين، ج٣، ص١٢٢.

٢) فِقه السُّنَة بە کوردی، و: حمە أمين برزنجی، ب٣، ل٦١٩.

٣) هەنگاو، بلاَوکراوەیەکی پەروەردەیی، ڕێکخراوی قوتابیانی کوردستان، ناوەندی چەمچەماڵ، ساڵی پێنجەم، ئازاری ٢٠٠٧، ل٧، ل٨.

٤) جِبريل يَسْأَلُ وَ النَّبِيُّ يُجيبُ، محمد حَسّان ج٤ ص٥، ص٤٢.

٥) بەرەو لوتکەی بەختەوەری، جەزا بارامی، ب٢، ل٥٦.

٦) فرمێسکی گوڵە، م. غريب پێنجوێنی، ل٢٧.




کەسایەتی مرۆڤی مسوڵمان لە ئاینی ئیسلامدا زۆر گرنگی پێدراوە، سەرچاوەی گەیاندنی ئەم ئیسلامەتیە بە ئێمە دوو شتە:

١- قورئانی پیرۆز، ٢- فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ.

قورئانەکە خوای گەورە زەمانەتی پاراستنی کردوە بە کەسیشی نەسپاردووە، هەر خۆی چۆن لە (لَوْحٍ مَّحْفُوظٍ) دابەزیوە -سبحان الله- هەتا ڕۆژی قیامەت نوقتەیەك سەرو بۆرێك ووشەیەکی لێ زیادو کەم ناکات، کە ئەمەش یەکێکە لە موعجیزاتی ئەم قورئانەو لەهەمان کاتیشدا موعجیزەی ئیسلامیشە، وە خوای گەورەش نەیسپاردووە بە هیچ مەلایەك، یان پیاوچاکێك، بە هیچ بەرگری لێکەرێك، ئەوەیان خۆی دەیپارێزێ.

## پەیوەندی زانستی فەرمودە بە شەخسیەتەوە

بەشی دووەم کە ئیسلامەتی بە ئێمە دەگەیەنێت، فەرموودەکانی پێغەمبەرە ﷺ، هەرچەندە وەحی خوایە، بەڵام لەسەر زوبانی بەشەرێکەوە دادەبەزێت کە حەزرەتی محمدە ﷺ، بۆیە قورئان جیاوازیەکی زۆری هەیە لەگەڵ فەرمودەدا، فەرمودە هێشتا دەرفەتی ئەوەی تێدا هەیە خوانەناسێك، بێ دینێك، دەستکاری بکات، لێی زیاد و کەم بکات، یان کەسێك بەنەزانی بیکات.. بۆیە هەر لە کۆنەوە زانایانی بەڕێزی ئیسلام، (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) قۆڵی مەردایەتیان لێ هەڵماڵی، وەك: ئیمامی بوخاری و موسلیم و موسنەدی ئیمامی ئەحمەد و ئەبو داود و ترمذي نەسائی و..) گۆڕیان پڕ نور بێت و خوا لە جیاتی ئێمە و هەموو

ئومەتی ئیسلام پاداشتیان بداتەوە، بە پوخت و خاوێنی فەرموودەکانی پێغەمبەریان بۆ گواستوینەتەوەو، لە چەند کتێبێکدا کۆیان کردوەتەوە.

لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا ﷺ گەلێك جار گوێ بیست دەبین دەوترێت ئەم فەرموودەیە صەحیحە، ئەمەیان لاوازە، ئەوە حەسەنە، ئەو فەرموودەیە مەوزوعەو هەر وەرناگیرێت، هەر هەڵبەستراوە بە دەم پێغەمبەرەوە ﷺ، باشە ئەم پۆلێن کردنی فەرمودەیە بە چی دەزانرێت؟! لە ڕێگەی کەسایەتی ئەو کەسەوە کە فەرمودەکەی گێڕاوەتەوە، کەئەمەش بابەتەکەی ئێمەیەپەیوەست دەبێتەوە بە شەخسیەت.

ئیمامی بوخاری فەرموودەکەی لە فلاّن کەس بیستووە، ئەویش لە فلاّن کەسی بیستووە، ئەویش لە فلاّن کەس، (**حَدَثْنا حَدَثْنا**) تا دەڵێت لە ئەبو هورەیرەم بیستووە، یان لە خاتوو عائیشەم بیستووە..

ئیمامی بوخاری –ڕەحمەتی خوای لێبێت–، کە کتێبەکەی (صەحیحی بوخاری) ڕاسترین کتێبە لە دوای قورئانی پیرۆز لە دینی ئیسلامدا، ئەفەرمووێت: هاتووە یەك بە یەکی ئەم کەسانەی هەڵسەنگاندووە، ئەم پیاوە ناوی چیە، کوڕی کێیە، لە بنەماڵەی کێیە؟ ڕەوشتو ئەخلاقی چۆنە؟ ئەگەر لە هەموو تەمەنیدا شاهیدێك وتبێتی یەك جار درۆیەکی کردوە، فەرمودەکە لە صەحیح دادەبەزێت بۆ لاواز (ضعیف)!

پلەی فەرمودە کە دێتە خوارێ چونکە ئەم پیاوە، دەڵێت: (**فیهِ نَظَرٌ**) تێبینی لەسەر ژیانی هەیە، ئەگەر جارێك لە جاران خوانەخواستە لەسەر ڕێگەی ژنان بینرابێت، فەرمودەکە پلەیەکی دیکەش دێتە خوارێ!

ئەگەر درۆی لەگەڵ ئاژەڵێك كردبێت هەر لێی وەرنەگرتووە، ئیمامی بوخاری چەند ڕێگای سەد كیلۆمەتری بڕیوە، وتویانە پیاوێك لە فلان شوێن فەرموودەیەكی پێغەمبەری لایە ﷺ، كە چووە بۆ لای سەیر دەكات ئاوا لۆچی عاباكەی، جزداشەكەی كۆكردۆتەوە بۆ ئەوەی حوشترەكەی بانگ بكاتەوە، ئیمامی بوخاری كە سەیر دەكات هیچی تێدا نیە بەڵام حوشترەكەی پێ دەخەڵەتێنێت فەرموودەكەی لێوەرناگرێت، هەرچی كابرا سوێندی بۆ دەخوات بەڕاست و ڕەوانی بۆت دەگێڕمەوە، دەفەرمووێت: تۆ درۆت لەگەڵ بێ زمانێكدا كردووە نابێت فەرموودەی پێغەمبەرت لێوەربگیرێت، شەخسیەتت لەكەدار بووە!

لەبەر ئەوە شەخسیەت زۆر گرنگە، ئەو فەرمودە لەو پلەیە دێتە خوارەوە چونكە یەكێك لە گێڕەوەكانی بەشێك لە شەخسیەتی لەكەدارە، بە یەك درۆ.

## كۆدی كەسایەتی

گەلێك جار وتوومە هەروەك چۆن لەوڵاتی خۆمان كۆدی ئاسایش هەیە بۆ هەموو خێزانێك، یان فەرمانبەرێك كە لەدەزگای ئاسایشی حكومی كۆمەڵێك پرسیاری دوورو درێژت لێدەكەنو هەموو وەڵامەكاتی لای خۆیان تۆمار دەكەن، بۆ ئەوەی ئەم زانیاریانە سەبارەت بەو كەسە هەبێت پێی دەڵێن كۆدی ئاسایش، لەزۆربەی وولاتانیش هەیە، خۆزگە كۆدی شەخسیەتی ئینسانیش هەبوایە، بۆ ئەوەی ئینسانێك لە وەزیفەیەكدا دانرا سەیری شەخسیەتەكەیان بكردایە، تا چەند شەخسیەتی قابیلی ئەم شوێنەی هەیە، بۆ نمونە: هەر لە خۆمانەوە دەست پێبكەین مامۆستایەكی دینی مزگەوت كە دەبێت بە پێش نوێژو ووتاربێژی

مزگەوتێك، دین و دونیا بۆ خەڵك ڕوون دەكاتەوە، چەند زانستەكەی بنەمایە، شەخسیەتەكەی گرنگترە.. چونكە ئەگەر شەخسیەتیەكی بەڕێزی نەبێت، خەڵك دینی ئیسلامیشی لەبەر چاو ناشرین دەبێت، ئەگەر حەقیش بڵێت لێی وەرناگرێت، دەبێ بزانرێت تا چەند كەسایەتیەكی سەنگینە، تا چەند دەتوانێت ئەمانەتی ئەم ئیسلامەتیە ڕابگرێت؟.

## بە هەڵوێستێك مسوڵمان بوو

لە وڵاتی بەریتانیا چەند ساڵێك لەمەوبەر، یەكێك لەو مامۆستایانەی كە ئیمامەتی مزگەوتێك دەكات لە شاری لەندەنی بەریتانیا بۆمان دەگێڕێتەوە، دەفەرمووێت: جارێكیان سواری پاسێكی كرێ بووم، كابرا باقی دامەوە، كە باقیەكەم وەرگرتەوە چەند (بنسێك) –واتە: وەكو چەند دینارێكی تەبع، پەنجا دینارێكی تەبع بۆ نمونە، لەم پارەی خۆمان كە هەر نرخێكی نیە،– زیادەم وەرگرتبووە، وە وتم جا ئەو پارەیە قابیلی ئەوەنیە بیگێڕمەوە و ببێتە زیادە و كەمە، ئەوانەش پێوییستیان بەو بڕە پارە كەمە نیە، شایەنی دەنگە دەنگی ناو پاسێك نیە، خستمە گیرفانمەوە..

لە قاپیەكەدا خەریكبوو دابەزم بیرم كردەوە وتم: لە ئیسلامدا حەلاڵ و حەرام، كەم و زۆری نیە، حەرام ئەگەر كەمیش بێت هەر حەرامە، بۆیە وتم: كاكی شۆفێر، (بە زمانی ئینگلیزی) ئەم پارەیە ئەوەندەی زیادەبوو، كابرا ئاوڕێكی دایەوە و سەیارەكەی لە لاجادەكە وەستاند و وتی: تۆ ئیمامی فلان مزگەوت نیت؟! مامۆستا وتم: بەڵێ، وتی: من سوپاس بۆ خوا دڵم ئارامی گرت، دەمێكە بە تەمای

مسولْمان بوونم، بەلاّم وتم با پێشەواکەیان تاقی بکەمەوە، بزانم لە کەمێك حەرام خۆی دەپارێزێت، ئەم دوای نیوەڕۆیە دێمە خزمەت و مسولْمان دەبم!

دواتر دەلْێت: سوێند بە گەورەیی خوا ئەو پارەیەت هەلْگرتایە لە ئیسلامەتی پەشیمان دەبوومەوە!!

ئەم کەسە سەیری ئەو هەموو وەعز و ئیرشادەی مامۆستای نەکردووە، سەیری ئەوەی کردووە لە پەنجا دیناری تەبعدا دەپرسێتەوە یان نا، واتە سەیری کردەوەکەی کردوە.

بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (**مِنْ إقْتِرابِ السّاعَةِ إذا تَعَلَّمَ عُلَمائُكُمْ لِيَجْلِبُ بِهِ دَنانيرَكُم وَ دَراهِمَكُم وَ اتَّخَذتُمُ القرآنَ تِجارة**) یەکێك لە نیشانەکانی هاتی قیامەت و تێکچوونی ئەم دونیایە و تێکچوونی شیرازەی هەموو شتێك ئەوەیە، دەفەرموێ: زانا ئاینیەکان بۆیە عیلمی شەرعی فێردەبن، بۆ ئەوەی دینارو درهەم لە خەلْك وەربگرن و خۆی پێ بژیەنن، کابرا ئەوەندەی مەبەستی پارە و موچەو بەراتەکەیەتی، ئەوەندە بەلایەوە گرنگ نیە ڕاستیەکە وەك خۆی دەگەیەنێت یان نا، زۆر جار خۆی لە حەقەکان لادەدات.

خۆشەویست ﷺ فەرمووی: قورئان وەکو هەر شتێکی تر بازرگانی پێوە دەکرێت، دەبینین کابرا بە پارە قورئان دەخوێنێت، ئەو دەلْێت زۆر بخوێنە، ئەو دەلْێت کەم بخوێنە، ئەو دەلْێت درێژە، ئەو دەلْێت، کورتە وەکو بە لۆتی و چاوەشێك بلْێت وابکە و ئاوای بلْێ. جاران پیرەمێردێکی بەڕێز، هەر جوزئی عەممەی لەبەر بوو، هەموو عالەم لەبەری هەلْدەسا، دەیان وت فلاّن کەس قورئانی لە سنگدایە، فەقێیەك چونکە بەپاکی لەبەر خوا قورئانی دەخوێند، سەد ڕەیس عەشیرەت لەبەری هەلْدەستا، دەیان وت ئەوە فەقێیە، ئەوە قورئانی لە

سنگدایه، چونکه قورئانەکە نەکرابوو بە پارە، نەکرابوو بە بازرگانی، شەخسیەتی بە ئینسانەکە بەخشیبوو، بەڵام بە داخەوە کە کرا بە بازرگانی و بە پارە خوێندنو معامەلە پێوە کردن نە مەلایەتی قەدری دەمێنێت، نە قورئان خوێن شەخسیەتی دەمێنێت، خەڵك بە ئارەزووی خۆی ئەمری بەسەردا دەکات و دەیهێنێت و دەیبات.

## پیشەو کەسایەتی

- دکتۆری بە شەخسیەت

جا بگەڕێوە بۆ هەموو کارەکانی تر، دکتۆرێك کە دەبێتە دکتۆر چەندە زانستەکەی ئەساسە لە جەراحیدا، لە ناسینی دەرمان ناسیدا، کەسایەتی ئەوەندە ئەساسە، ئەم دکتۆرە ناسنامەیەکی بۆ بکرێت چەند ئەمینە، چەند نهێنی پارێزە، چەند ڕێز و حورمەتی خەڵك دەچێتە بەردەستی، وەکو خوشك و دایکی خۆی سەیری دەکات، چەندە لێبوردەیە!

نمونەی ئەو دکتۆرانەش هەن کە جاری واهەیە هەژارێك چۆتە لای پارەی پێنەبووە، وتوویەتی ئاساییە من سەد نەخۆش دەبینم، دەبا یەکێکیان پارەی تێدا نەبێت.

بەڵام نمونەی لەو جۆرەشی هەیە کە نەخۆش هەبووە لە هۆڵی نەشتەرگەری خەستەخانەی تایبەتدا بووە، دکتۆرەکە کەناو سکی هەڵدڕیوە، هاتۆتە دەرەوە بۆلای کەسو کاری وتوویەتی: من پێشتر وتم بە دوو ملوێن نەشتەرگەریەکە دەکەم، بەڵام من نەمزانیوە ئەوەندە ڕیخۆڵەکانی عەمەلیاتەکە سەعاتێکی تری

کەی زیاتر دەوێت، بۆم نەکەن بە سێ ملوێن بەجێی دەهێڵم، ئەیسپێرم بە دکتۆرێکی دیکە..! ئەمە بێ شەخسیەتیە. ئەبێ بڵێ: ئەگەر پارەشم نەدەنێ، ڕۆحی ئەو ئینسانە بەهەموو دونیا نادەم، چونکە من کە شەهادەکەم وەرگرت سوێندم خوارد کە ڕۆحی مرۆڤم لە لا لەهەموو شتێك گەورەتر بێت.

هی واهەیە مامۆستایەکی قوتابخانەیە، ئەگەر شەخسیەتی نەبێت پیاوێکی جنێو فرۆشە، منداڵەکە لەبەردەستیدا فێری جنێو فرۆشتن دەبێت، چەند مامۆستا هەیە کە ژمارەیان کەمە، بە جنێو بانگی خوێندکار دەکات. زۆر بەتوندی لێی دەدات ئەمە وا لەو خوێندکارە دەکات فێری کەم شەخسیەتی ببێت.. یان هەندێ لەمامۆستاکان بەپێی پێویست خوێندکارەکان فێرناکەن ئەو زانستەی کەلەوێ دەیبەخشن زۆر لەوە کەمترە ئەگەر بەتایبەت بەخوێندکاری بڵێن بەپارە!!

- کەسایەتی هونەرمەند

هونەرمەندێك چەند زەرورە کە شەخسیەتی هەبێت، لە ڕێگای هونەرەکەیەوە، لەڕێی شانۆکەیەوە، لە ڕێی گۆرانی و تەمسیلەکەیەوە، ئەگەر پیاوێکی شەخسیەتدار بێت، دێتە ناو کۆمەڵ و کۆڕەوە، خەڵك دەستی بۆ بەسنگەوە دەگرێت، هەشە بەس خەڵکی فێری بێڕەوشتی کردووە، چەند جوانە هونەرمەندەکانمان وشاعیرەکانمان شەخسیەتیان بەرز بێت، پیاوێکی وەکو پیرەمێرد ئاخر ساتی ژیانی وەسیەتەکەی ئەوەیە دەڵێت: (ئامان براکانم دونیا بە گران مەگرن، خزمەتی میللەتی خۆتان بکەن، دەستی داماوان بگرن، لە دینی محمد لامەدەن، خوا و پێغەمبەرتان بە حەق خۆش بوێت، لەگەڵ یەك تەبا و برابن).

هەندێ بەناو شاعیریش هەن هیچ نازانن ئیهانە بە دینی ئیسلام نەبێت، بە پیرۆزیەکانی ئەم دینەو بە ئازار دانی خوا و پێغەمبەر نەبێت.. لەچەند نوسینێکدا دەڵێن شیعرە، نەخێر ئەمە هەر قسەو دەنگی گەورەیە لەسەر موکەبەرە دەیخوێنێتەوە ناوەڕۆکی پوچە، شەخسیەتی نەماوە لەناو خەڵکداو بەچاوی بێ ڕێز سەیری دەکات.

- کەسایەتی شۆفێری تەکسی

ئێمە لە هەموو بوارەکاندا پێویستمان بەوەیە کۆدی شەخسیەت بۆ خۆمان، بۆ ئەو کەسانەی وەزیفەیان بە دەستە بدرێتە دەست، هەیە ئەبێتە شۆفێری تەکسی، لە ئاینی ئیسلامدا ئەگەر حکومی پێ بکرێت، پێش ئەوەی کە خەتەکە بە پارە بکرێت، پێویستە سەیری شەخسیەتی ئەم ئینسانە بکرێت تا چەند ئەم شۆفێری تەکسیە شەخسیەتی بەرزە، ڕاست وایە لە مۆڵەتی شۆفێریدا ڕەچاوی ئەخلاق‌و ئەدەبی ئەو کەسە بکرێت، کارێکی زۆر باش دەبوو.

خۆزگە حکومەت ئەوەشی دابهێنایە کە ئیجازە ئەداتە ئەو کەسە، سەیری کەسایەتی بکات، تا چ ڕادەیەك بەرزە کە ڕێگەی بدەی ژن‌و کچی خەڵك بگوازێتەوە، ئەمانەت بپارێزێت، لەکاتی شۆفێریدا تا چ ڕادەیەك پابەندە بەیاسای شوفێریەوە؟ پێش مۆڵەتدان ئەم مەرجانە پێویستە جێبەجێ بکرێت..

لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا مەسەلەی شاهیدی، گرنگیەکی زۆری پێدراوە. هەر کەسێك چوو لە دادگادا شکاتی کرد، لە ئیسلامدا وەرناگیرێت، بڵێ من شاهیدی دەدەم دەبێت ئەوکەسە بناسرێت، ئەبێ مەلەفی هەڵدرێتەوە، شەخسیەتی دیار بێت، ئەم شاهیدە ئایا درۆزنە، ئایا دزی کردووە پێشتر، ئایا جوێن فرۆشە؟ ئایا

سوێند بە درۆ دەخوات، ئایا تەلاق خۆری بەردەوامە؟ ئەگەر ئەمانە بوو نابێت بە شاهید وەربگیرێت لە دادگادا، بە داخەوە دادگاكانیش ئەمڕۆ ئەوە ڕەچاو ناكەن، هەركەس شاهیدی دا دەڵێت تەواوە وەردەگیرێت، بەڵام لە ئیسلامی ئێمەدا وانیە، سەیری شەخسیەتی شاهیدەكە، دەكرێ هەندێ مەرج دانراون بۆ ئەو كەسەی كە شاهیدی دەدات. یەكێك لەوانەی كە زانایانی ئاینی ئیسلام بەمەرجیان داناوە لەزەمانی خۆیاندا دەبوایە ئەو كەسە سەری ڕووت نەبوایە واتە شتێكی بەسەرەوە بوایە، دەنا بەشاهید وەرنەدەگیراو، ڕەد دەكرایەوە چونكە ئەم كارەی نامۆیە بە كۆمەڵگەكەو خەڵكی، بۆیە ڕەد دەكرایەوە، بەڵام بۆ ئێستا ئەم حوكمە هەڵدەوەشێتەوە یان مەرجی تایبەت دانراوە بۆ شایەتی دەر..

## مەرجەكانی ئیمامی عومەر بۆشاهید..

پیاوێك لە خزمەت ئیمامی عومەردا كێشەیەكی هەبوو لەگەڵ پیاوێكی تردا، ئیمامی عومەر فەرمووی شاهیدت هەیە؟! وتی: بەڵێ فلان كەس شاهیدمە، كە هاتە دیوانی شەریعەتی ئیسلام و خزمەت ئیمامی عومەر، بە شاهیدەكەی فەرموو: من تۆ ناناسم، بەڵام كە ناتناسم مانای ئەوە نیە لە شەخسیەتی تۆ كەم ببێتەوە، بۆیە ناتوانم حوكم بدەم بەوەی كە تۆ پیاوێكی چاكی یان خراپی، بە كەڵكی شاهیدی شەرعی دێیت یان نا، بڕۆ كەسێك بێنە تۆ بناسێت و شاهیدیت بۆ بدات، كەسێك لەناو مەجلیسەكەدا، لە كۆڕی شەرعدا، هەستا و وتی جەنابی ئیمامی عومەر من شاهیدی ئەدەم بۆ ئەم پیاوە، كەسێكی چاكە.. فەرمووی شاهیدی چی؟!

وتی: ڕاستگۆیی و دینداری..

فەرمووی: زۆرباشە منیش سێ پرسیار لە تۆ دەکەم سەبارەت بەم پیاوە: ئایا ئەم پیاوە دراوسێتە؟!ماڵت بەماڵیەوەیەتی ئاوا دراوسێ بن؟!

وتی: نەوەڵا، فەرمووی دەی ئاخر دراوسێ دەزانێت دراوسێکەی چۆنە لە چاکی و خراپیدا.

لە پرسیاری دووەمدا ئیمام فەرمووی: مامەڵەی دینارو درهەمت لەگەڵ کردووە؟ کابرا ووتی نەخێر.. کە دینار کەوتە بەینەوە ئەمجا چاکی و خراپی مرۆڤ دەردەکەوێت، ئەینا تۆ کابرا معامەلەت لەگەڵی نیە، چوزانی دز و درۆزن و دەست برە، ئایا ڕۆژێك مامەڵە کەوتوەتە بەینتانەوە؟! وتی: نەوەڵا..

فەرمووی: سێهەم مەحەك سەفەرت لەگەڵ کردووە؟! کە ڕەوشتی جوانو لێبوردەیو سەخێتیو دڵسۆزیو ڕاستگۆیی لە سەفەردا دەردەکەوێت.

فەرمووی: هەر لە مزگەوتدا دیوتە؟! وتی: بەڵێ لە جەماعەتەکان و جومعەدا دەیبینم.. فەرمووی: براکەم خۆت ماندوو مەکە، تۆ ناتوانی شاهیدی حەق بۆ ئەم پیاوە بدەیت، کاکە برۆ بە دووی کەسێکدا، یان دراوسێت بێ، یان شەریك معامەلەت بێ، یان هاوسەفەرت بوبێ، چەند جوانە محامیەك شەخسیەتی هەبێت، کاتێك لە پێناوی پارەدا ناحەقێك ناکات بە حەق، لە پارەکەی خۆی دەبورێت بەڵام میهنەکەی خۆی تێك نادات کە پارێزەریە، پارێزەری حەققە، نەك پارێزەرە لە پێناوی پارەدا، دادگاکەش بەهەمان شێوە.

ئەمرۆ ئێمە پێویستیمان بە زیندوو کردنەوەی ئەو شەخسیەتە بەرزانەیە، کەسێك دەبینی حکومەت دایناوە بە کاربەدەست، بەبێ ئەوەی بەدوایدا بچن ئەم کەسە چی بووە؟ ئاستی چۆنە؟ هەندێ جار کەسێ دەکەن بەبەرپرسی خەزێنە

دزترین کەس بوە پێشتر، ڕابردووەکەی دیارە کەچی بوە! لەبەرئەوە حکومەت دەبێ سەیری ئاستی ئەو کەسەو شەخسیەتی بکات. بێگومان چاکسازی بەم شێوەیە دەکرێ.کەکەسی شیاو لەشوێنیشیاو به کەسایەتی شیاو دابنرێ، مەرج نیە کەسەکە دیندار یان ئەهلی ئیمان بوو متمانەی تەواوی پێ بکەین..

پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك صەحابەیەکی پایە بەرزی وەکو ئەبو زەڕی غەفاری داوای لێدەکات، دەفەرمووێت بمکە بە مودیر ناحیەی شوێنێك، بە قایمقامێك، دەفەرمووێت: وەلاهی ئەی ئەبو زەڕ تۆ پیاوێکی لەو کەسانەی لە سەرەتای ئیسلامەتیەوە خەبات دەکەیت بۆ ئەم دینە، لە سەرەتایترین مسوڵمانەکانی، لەو کەسانەیت کە قورئانت لەبەرە، قەت درۆ ناکەیت، شەونوێژ دەکەیت.. بەلاّم پیاوێکی ئوموری ئیداریت پێ بەڕێوە ناچێت..

(**إِنَكَ ضَعِيفٌ**) زەعیفی لە ئیدارەدا، (**وَ إِنَّها أَمانة**) ئەمە ئەمانەتە، (**وَ إِنَّها خِزءٌ وَ نَدامة**) لە ڕۆژی قیامەتدا بۆت دەبێتە ماڵ وێرانیو پەشیمانی، بۆ دنیای خەڵك بۆ قیامەتی خۆشت..

چەند جوانە هەر پیشەیەك حکومەت دای نا بۆ کەسێك، سەیری شەخسیەتی بکا، کەسێ کارمەندی تەندروستیە، کە گرنگترین شت تیایدا پاك و خاوێنیە، ئەبێ کارگوزاری خەستەخانەیەك ئەوپەڕی پاك و خاوێنی پێوە دیار بێت، چونکە شوێنەکە شوێنی ئەوەیە، میکرۆبێك بە لاشەیەوە نەبێت..

یان کەسێ دەبێتە مجەوەری مزگەوت، ئەبێت سەیری دینداری بکەیت، سەیری ئەوەی بکەیت چەند بەلایەوە خۆشە خزمەتی مزگەوت بکاتو نوێژ بکاتو پاكو خاوێنی مزگەوت بپارێزێو شانازی بەوەوە بکات کەپیسی مزگەوتو

خەوش‌و خاڵی پاك بكاتەوە.. بەداخەوە لەهەندێ شوێن كارگوزاری مزگەوتمان هەن نە حەزیان بەمزگەوتە نە ئیشەكەیان، نە نوێژیش دەكەن! ئەمەش نەگونجانە بۆئیشەكەو گەندەڵی دروست دەكات‌و كسایەتی پلە نزم‌و سوك بەرهەم دێنێت.

ئێمە هەتا ئەم وڵاتەی خۆمان خۆش نەوێت، هەتا ئەم میللەتەی خۆمان خۆشنەوێت، هەتا خزم و كەس و كاری خۆمان خۆش نەوێت، بەچی خۆشمان بوێت؟! ئەگەر خراپ بوو لەگەڵی نەبین، ئەگەر براكەت خراپ بوو ستەمی لەخەڵك كرد پشتیوانی لێمەكە، ئەگەر چاك بوو هەوڵبدە چاكتر بێت، بەلاّم ئەگەر بۆ خراپە بوو دەستی بگرە، مەهێڵە سەمعەی عەشیرەتەكەت، هۆزەكەت، دێیەكەت، شارەكەت ناشرین بكات. ئێمە ئەگەر باسی ئیسلام دەكەین، جوانیەكانی خەڵكی بێ دینش دەبینین، ویژدانێكمان هەیە بە چاكی خەڵك دەڵێین چاك، بە خراپ و بێ دینی دەڵێین خراپ.



## متمانەی وڵاتان

ساڵی ٢٠٠٤ لە وڵاتی نەرویجدا، سێ کەسی خەڵکی وڵاتی نەرویج پانزە ساڵ بوو لە ئەمریکا دەژیان، کۆچیان کردبوو چووبوون بۆ ئەمریکا، دوای پانزە ساڵ هاتنەوە بۆ وڵاتەکەی خۆیان، کە هاتنەوە دەستیان کرد بە دوکان و بازاڕ و ڤێلاو شوقە کڕین، دواتر حکومەت چاودێری خستە سەر ئەم کەسانە (بەخەمخۆری) مەلەفی هەڵدانەوە، شەخسیەتی هەموو کەسێك لەوێ نوسراوە، کەچۆنە؟ سەیری کرد ئەم پیاوانە وەختێك کە لە نەرویج ڕۆیشتوون، لە برسان ڕۆیشتوون، هیچیان نەبووە، پەیوەندیان کرد بە باڵوێزی نەرویج لە ئەمریکا، چاودێری بخاتە سەر ئەم سێ کەسە کەپێشتر لەوێ ئیشیان کردبوو، بزانێت لە کوێ چ ئیشێکیان کردووە؟ ئیشەکەیان خزمەتکاری ماڵانو جادە پاك کردنەوەو ئەوانە بوو، واتە پارەکەیان بەس بایی ئەوەبوو کە پێی بژین.

ئەی ئەم پارەیە لەکوێ پەیدا بووە؟ کە ئەمانە لە پڕدا بە ملیۆن دۆلاریان پێیەو شوقەو ڤێلا دەکڕن؟! یەکسەر حکومەتی نەرویج دۆسیەیەکی کردەوە، لەگەڵ حکومەتی ئەمریکی دا، وتی بزانن ئەم کەسانە گرفتێکیان هەیە، هاتوونەتەوە وڵاتی ئێمە لە وڵاتی ئێوەوە بە پارەیەکی زۆرەوە هاتوون!

سەرەنجام لەو دۆسیەیەدا ئاشکرا بوو بانقێك بڕدراوە لە نزیکی ئەوان، بانقێك چەند ملوێن دۆلاری لێ دزراوە، دزەکانیش نەگیراون، حکومەتی نەرویجی هەرسێکیانی قۆڵبەست کرد و دایەوە بە ئەمریکا، ئیعتیرافیان کرد کە ئێمە ئەو بانقەمان بڕیوە، ئەو وڵاتە چەند ئیعتیبار پەیدا دەکات، گەر جارێکی دیکە کەسی

نارد بۆ ولاّتی ئەمرکیا، کە وتی نەرویجیم دەڵێ دانپیانراوە، چونکە ولاّتێکە ناهێڵێت دز لە ولاّتەکەیدا بێت.

## کەسایەتیو شوێن

مامۆستایەکی ئاینی خەڵکی هەولێر چووبوە لەندەن، وتی بە گەڕەکێدا ڕۆیشتین، وتم ئەم گەڕەکە یان پاکستانین، یان عێراقین، دوای دەرکەوت نیوەی پاکستانین و نیوەی عێراقین، وتیان: مامۆستا بە چی زانیوتە؟! وتی: خۆڵیان لە بەردەرگاکە فڕێ داوە، چونکە خەڵکی ئەو ولاّتە ولاّتی خۆیان خۆش دەوێت، هەر زانیومە ئەخلاقی ولاّتی خۆمانیان فڕێ نەداوە، لەسەر جادەکەیان پیس کردبوو، چەند جوانە ئینسان سەمعەی ولاّتەکەی پارێزراو بێت، سەمعەی دینەکەی پارێزراو بێت بە خەڵکی باش.

جاری واهەیە کەسێ هیچ عەیبەی نیە، کە وتیان خەڵکی فلاّن دێیە یەکسەر سەمعەی دادەبەزێت، کە ئەڵێن خەڵکی فلاّن بنەماڵەیە، کچێکی زۆر ڕێك و پێکە، کوڕ نایەوێت چونکە دەڵێن خزمی فلاّن کەسە، لە کاتێکدا ئەمە لە ئیسلامیشدا ڕەدکراوەتەوە، لەبەرئەوە شەخسیەت هەر کاریگەری بۆ خۆت نیە، بۆ سەر خەڵکی تریشی هەیە، حورمەتی شوێنەکان دەبێت پارێزراو بێت.

### ـ مزگەوت

خوا لە قورئاندا هەموو شتێکی بۆ ئێمە بەیان کردووە، ئەفەرمووێت: دەبێت مزگەوت شەخسیەتی هەبێت، مزگەوت هەر بیناکەی شەرت نیە، هەر گومەز و

منارەکەی‌و هەرگەورەیەکەی و ئەهلی جومعەکەی شەرت نیە، شەخسەتی مزگەوت شەرتە، خوا لە قورئاندا فەرموویەتی: ﴿وَأَنَّ ٱلۡمَسَٰجِدَ لِلَّهِ﴾ مزگەوتەکان ماڵی خوان، تایبەت هی خوایە، (لِلَّهِ) تایبەتن بە خواوەو، هی کەس نین، بەڵام شەخسیەتی مزگەوت بە چیەوە بەندە؟!

﴿فَلَا تَدۡعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدٗا﴾ جگە بانگەواز بۆ خوا نابێت بانگەوازی بۆ کەسی دیکە تێدا بکرێت، نابێت کەسی دیکەی تێدا بناسێنرێت، نابێت کەسی تری تیا مەدح بکرێت، یان دوژمنایەتی کەسی تێدا بکرێت، جگەلەوەی دەوترێت خالیسەن موخلیسەن بۆ خوا بێت، شەخسیەتی مزگەوت بەوەوەیە بەس بۆ خوا کاربکات، ئەگەر لەوە لایدا، شەخسیەتی نامێنێت، چونکە خوا فەرمووی: ﴿فَلَا تَدۡعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدٗا﴾ تۆ بۆ شتێکی تر بەکارت هێنا.

- زانکۆ

زانکۆ چەند پیرۆزە، ناوەندێکی مەعریفی و زانستی و ئەکادیمیە، ئەگەر وەکو زانکۆکانی ئەمڕۆ بە داخەوە بوو بە جێگای کات بەسەر بردن، خۆڕازندنەوەو یەکتر بینین‌و، خۆ پیشاندان‌و نواندنی جل‌و بەرگ.. وەکو ئێستای لێدێت، دەرچوانی زانکۆی ئێستا، ئاستی زانستیان وەك کەسێکی جاران وایە بڕوانامەی شەشی سەرەتاییان هەبێ.. چونکە نە زمانێکی دیکە دەزانێت نەزانستێکی پێیە، نەلێکۆڵینەوەو داهێنانێکی هەیە.. ئەمەش لە شەخسیەتی زانکۆکە دادەبەزێنێت..

زانکۆیەکی ئەمریکیو (هارد ڤارد)ی بەریتانی چ جیاوازیەکی لەگەڵ زانکۆی سلێمانیو صەلاحەدین هەیە؟ تەنها ئەوەیە ئەو لەوێ بەس خەریکی زانستە، ئەمەی ئێمەش بەس خەریکی کات بەسەربردنو خۆ گۆڕینو تاقیکردنەوەی مۆدێلاتە، لەگەڵ بەشداری ئاهەنگوسەفرە! ئەمەش وای کرد بڕوانامەکەی لە هیچ شوێنێك دان پیانراو نەبێو، بەبێ شەخسیەت سەیری بکرێو، بچێتە نزمترین ئاست لەجیهاندا.

## بێ شەخسیەتی لە نیشانەکانی قیامەتە

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: وەلاهی بە چاوی خۆتان دەبینن ئاماژە بۆ خەڵك دەکرێت، بۆ پیاوێك دەکرێت، دەڵێن (ما أَجْلَدَهُ) ئای پیاوێکی چەند بلیمەتە، چەند ئازایە، چەند ناودارە، (ما أَظْرَفَهُ) چەند قسە خۆشو حەکیمو زانایە! (ما أَعقَلَهُ)، چەند ژیر و دانا و عاقڵە (وَما فِي قَلْبِهِ مِثْقالُ حَبَّةِ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمانٍ) فەرمووی: سوێند بە خوا بەقەدەر تۆوی خەرتەلە ئیمان لە دڵیدا نەماوە، یەك زەڕە ئیمان لە دڵیدا نیەو، خەڵکیش ئاوا پەنجەی گەورەیی بۆ ڕادەکێشن. چونکە هەیە بەس پارە دەناسێت، لە دینارێك خۆش نابێت، بەلام یەکجار بڵێ (لا إله إلا الله) پێی سوکیە، چونکە بۆ قیامەت هیچ تموحی نەماوە، زیکری خوا بکات قورئان بخوێنێت بەلایەوە عەیبەیە، چونکە تموحی قیامەتی نەماوە، بە داخەوە کەسی بەشەخسیەت دەگمەن نەبێ کەسی دڵسۆزو بەوەفا ڕاستگۆو موخلیسەکان بەپەنجە ئاماژەیان بۆ دەکرێ.

له صەحیحی بوخاری و موسلیمدا لەبەشی نیشانەکانی قیامەتدا هاتووە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (**یَنطِقُ فیها الرُّوَیبضَةُ قیلَ: وَمَنْ الرُّوَیبضَةُ؟! قالَ: السفیهُ یَتَکَلَمُ فِي أَمْرِ العامة**) فەرمووی: ئەو کاتە شیرازەی دونیا تێك دەچێت، ژیان تامی نامێنێتو کەس لەخۆی ئەمین نابێت، کە ڕوەیبیزە قسە دەکات!

وتیان: ڕوەیبیزە چیە ئەی پێغەمبەری خوا؟!

فەرمووی: ناکەس بەچەی کوڕی ناکەس بەچە ئیشی گشتی خەڵکی دەکەوێتە دەست! کەس نازانێت کێیەو ئەصلّ و فەصلّی چیە؟ ئەویش بە ئارەزووی خۆی خەڵك دەچەوسێنێتەوە، واتە: خەڵکی بێ شەخسیەت کاروباری ئەو میللەتەی دەکەوێتە دەست.

فەرمووی: ئەو کاتە ژیان بەهای نامێنێت، لەبەشێکی دیکەی فەرمودەکەدا دەفەرموێت: شەخسیەت و قەدر و حورمەتی دایك و باوك نامێنێت.

فەرمووێ: (**إِذا وَلَدَةِ الأَمَةُ رَبَّتَها**) فەرمووی وەلاهی ئەولاد بە چاوی خزمەتکاری سەیری دایك و باوکی خۆی دەکات، چەند کچ هەیە ئێستا دایکی خزمەتکاریەتی، هەتا کچەکە لەخەو هەڵدەستێت، کچی تازە پێگەیشتوو یان ئەوانەی لە زانکۆ و لە پەیمانگان، ئەبێ دایکی نان و چاکەی بۆ حازر بکات و کە هاتیشەوە جلەکانی بۆ بشوات!

چەند کوڕ هەیە بە چاوی خزمەتکاری سەیری باوکی دەکات، بەس بە پارە پەیدا کەر، بە حەماڵی بازاڕ، ئێوارە عەلاگەی بۆ بێنێتەوە، ئەینا هیچ قەدر و حورمەتێکی باوك و کوڕێتی و دایك و کچێتی نەماوە. بەداخەوە ئەوە نیشانەکانی قیامەتن شەخسیەت نامێنێت، کەجاران گەورەترین سەرمایەی مرۆڤ بوو.

## جوانە گازەرد خێر بێت لەپێناوی تۆدا !

بەسەرهاتێ لە دێی مۆریتچە لە ناحیەی ئاغجەلەری قەزای چەمچەماڵ ڕویداوە.. پیاوێکی زۆر ناودار و پیاوانە و ڕیش سپی ئاوایی ناوی حاجی شەریف بووە، کۆمەڵێك پیاوی بەڕێز و مامۆستای ئاینی میوانی دەبن و، لەلای دەمێننەوە. بەیانی کە لە نوێژی بەیانی دەگەڕێنەوە، بانیژەیەك دەبێت لەسەری دادەنیشن، ئەم ماڵە مەڕ و ماڵاتیان دەبێت، لەو کاتەدا مەڕ و ماڵات لە پەچە دەردەکرێتو حەوشە بە جێ دێڵێت، یەکێك لە کچەکانی، یان لە بوکەکانی ماڵ دێت دەست دەکات بە حەوشە ماڵین..

ئەو خەڵکەش سەیری ژێرەوە دەکەن، شوێنەکەیان وا دەبێت، حاجی کە سەیر دەکات بایەکی توند هەڵدەکات، خەریکە کراسی کچەکەی، یان بوکەکەی هەڵدەداتەوە ئاوەڵ کراسەکەی دەردەکەوێت، ڕەنگی زەرد دەبێت، عارەق دەردەکاتەوە، هاوار دەکات دەڵێت یا الله فریام بکەویت! جوانە گا زەرد بە پێناوی تۆدا صەدەقە بێت!

ئەڵێن: حاجی ئەوە چی بوو، نەخۆش بووی، دەست بۆ سەر دڵی دەبات دەڵێت هیچ نەبوو، وەڵاهی بەدڵمدا هات خێرێك ئەنجام بدەم، میوانەکانی دەڕۆن و بە ئەمینی کوڕی دەڵێت، کوڕم: برۆ جوانە گازەرد کە دابەستەیە و وەختی فرۆشتنی هاتووە و پارەیەکی مۆڵ و باشی ئەو سەردەمە دەکات، بێنە سەری ببڕە و بەبێ جیاوازی بەسەر فەقیر و هەژاری دێدا هەمووی دابەشی بکە.

دەڵێت: باوە گیان بەسەر چاو ئێمە خاوەن ماڵ نین لە ئاستی قسەی تۆدا، بەس تو ئەو خوایە ئەم خێرە لەم کاتە کت و پڕەدا بۆ ئەنجام درا؟ فەرمووی:

ڕۆڵە بابەکە هات و کچەکەم خەریك بوو ئاوەڵ کراسەکەی بەدەر بکەوێت لە ژێرەوە، لەو کاتەدا دوعام کرد و هاوارم کرد پێم عەیب بوو هاوار بکەم لەبەر چاو میوانەکاندا، وتم خوایە شەرمەزار نەبم لەبەر چاوی ئەو پیاوە بەڕێزانەو ئابڕووم نەچێ و ئەم ئافرەتە دابنیشێت و بە دانیشتنەوە پەچەکە بماڵێت! لەو کاتەدا ئافرەتەکە دانیشت و پشتی ڕووی لە میوانەکان کردوو پشتی تێکردن و پەچەکەی بەڕێك و پێکی ماڵی.

سەرمایەی گەورەی ئێمە شەخسیەتی ناو ماڵەکانمان بوو.. ئێمە خاوەنی ئەم میللەتەین، ئەمە دڵ پیسی نیە، هەتا ئەو پیاوانە هەبوون تەلاّق کەم بوو لە دادگاکاندا، هەتا ئەو پیاوانە هەبوون کچی خەڵك سوکایەتی پێنەدەکرا، هەتا ئەو پیاوانە هەبوون کچت هەبوایە بە حورمەتەوە دەستت ماچ دەکرا، نەك هەتا مارەی دەکات! ئافرەت نەدەبوو لە هەموو سەرنگوێلسکێك فڕێ بدرێت، ئەمە ئالتونێك بوو.

بۆیە ڕێز بۆ ئافرەت ئەوە نیە لاسای خەڵکی ئەوروپاو دەرەوە بکاتەوەو لەشێوازی جلو بەرگی ئەوان بپۆشێ، ڕێز ئەوەیە کە ئیسلام فەرموویەتی، شەخسیەت لە شەریعەتی خوادایە شەرعی خوا جێبەجێ بکە، شەخسیەتت دەبێتو، ئابڕوت پارێزراو دەبێتو، عیزەتداری دونیاو قیامەت دەبێت..



## شەخسیەت لەسەرەمەرگدا

گرنگە لە سەرەمەرگیشدا شەخسیەتت هەبێت، وەك قورئان دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ﴿٢٨﴾ فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي ﴿٢٩﴾ وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي ﴿٣٠﴾﴾ الفجر:٢٧-٣٠. مەلائیکەت بلێ وەرە دەرەوە ئەی ڕۆحی پاك بۆلای خوایەك کە لێت ڕازیەو، ئەچیتە قەبرێکەوە ئەبێ بە باخێك لە باخەکانی بەهەشت لە هەموو کۆشکی دونیا گەورەترە! زۆر کەسیش هەیە لە سەرەمەرگیشدا مەلائیکەت لێی تورە دەبن، وەرە دەرەوە ئەی ڕۆحی پیس بۆ لای خوایەك کە لێت ناڕازیە، پەنا بەخوا.

## زەنگی مەرگ

{دوێنێ لە دونیا میوان بوویت، لە چوارچێوەی کات و شوێنی دیاریکراو

زەنگی مەرگ لەناکاودا لێی دا و وتی کاتت تەواو..

سەرمایەی تەمەنی دونیا سەهۆلێك بوو وا بوو بەئاو!

ڕاستە دوێنێ ناوت هەبوو، باوت هەبوو، بەلأم ئەمڕۆ گیایەکی دروێنە کراو..

هەویە و پولّ و پارەی گیرفان، ژیان لەگەلّ کۆڕی دۆستان، سەفا و سەیران،

گەرمێن کوێستان، خەونێك بوون و بڕانەوە..

کەتۆ بوویتە نێچیرێك و کفن لە ئامێزی گرتیت، ئەوانە گشت شارانەوە..

دەڕامێنە لە حالّی خۆت، لەو گۆڕەی بوو بە مالّی خۆت، سەرین بەردە و ڕایەخ وا گلێکی سەردە، چ کونجێکی تەنگەلأنە، تۆ ژووری وات قەت نەدیوە..

تۆ ژووری وات قەت نەدیوە، لە جیاتی دارە ڕای سەربان، ڕووپۆشیان بە بەرد

تەنیوە، وەك خانووی سەر دونیا نیە و لە گڵدا دایان بڕیوە!

دە بپرسە کوا کەی ماڵ و هەیوان وایە، نە پەنجەرە، نە دەرگایە،

بواری دانیشتن نادات، تەنها ژوورێکی باریکە، چونکە گشت لای هەر دیوارە،

هەتاکو بڵێی تاریکە..

ئای چ ڕۆژێکی ڕەشە، ئای چەندە ڕۆژێکی ڕەشە! کەس لا لەکەس ناکاتەوە..

بۆ ساتێکیش دەرگای ماڵی ناکاتەوە..

گەرچی زۆر کەس بارکەوتەیە، کەس دڵی کەس ناداتەوە..

نەهەواڵێك، نەسلاوێك، نە سەردانێك، نە تیمارێك، نە بەخشینی قومە ئاوێك،

گڵ چاوی پڕکردوونەوە..

تالاوی گۆڕی تەنیایی زۆر شتی بیر بردونەوە..

ئەوە زامی شەرای مەرگە وا تاسی پێ بردونەوە، کەسێك نیە بانگی بکەیت..

دەکوا باوك و دایك و برا، تروسکەیەکی ڕووناکی بەدی ناکەیت!

کوا شەوقی گڵۆپ و چرا، پێ نازانیت چ کاتێکە؟

کوا سەعاتە دێرینەکەت بۆ لە دەستت داکەندرا؟

جگەر گۆشەی دڵسوتاوت بێ ناز ماون باوکی چاکیان بۆ کوێ برا؟

ڕوت کراوی لە دونیادا پارە و نامە و هەویە و خامە چیان لێ کرا؟

جا ڕێبواران لە ڕێی نزیکی گۆڕستان یەك دەدوێنن، باسی تۆ و گۆڕەکەت

دەکەن دەڵێن، دوێنێ هەڵکەندرا، فلان کەسی تیادا نێژرا..

جانازنم، جانازانم بۆ پەپولەی ڕۆحی ماندوت، مەنزڵی گۆڕ بەندینخانەی ترس و

خەمە، یان کەژاوەی ناز و ئەوین، گوڵزارێکی بەهەشتیە، پەنا بەخوا یاخود

چاڵێکی ئاگرین، مەستی خەندە و پێکەنین یا شیوەن و ئاهو گرین؟!

ده ڕاکشێ به تەنهایی، دڵنیابە تۆ مردوویت، وا ئەمجارەش زەوی بۆت بۆتە

دایك و بۆ لەدایك بوونێکی تر لە ئامێزی خۆیی گرتوویت..

مانەوەت لەم بەرزەخەدا حەملێکی درێژخایەنەو بە تۆ مانگ بۆت تەیی ناکرێو

نابڕێتەوە.. سەری سندوقی گۆڕەکەت بە شەیپوری دووەمی ئیسرافیل نەبێت

ناکرێتەوە..



**خاڵە بنەڕەتیەکانی ئەم بەشە:**

❁ **إعْلَمُوا أَيّها المُسْلِمُونَ، أَنَّ (الرُّجولَة): كَلِمَةٌ عَظيمَةٌ، لَها إيحاءاتٌ كَريمَة، تَخْتَلِفُ بِلا شَكٍّ عَنْ إحاءاتِ كَلِمَةِ الذُّكورَة، و إنْ شِئْنا الدِّقَة، قُلْنا: إنَّ الذُّكورَةَ لِبَيانِ النَّوْعِ وَالجِنْسِ، وَ الرُّجولَةُ لِبَيانِ الحَقيقَةِ وَالكَيْفِ، أَمّا مِنْ ناحِيَةِ النَّوعِ وَ الجِنْسِ، فَقَدْ قالَ تَعالى:** ﴿وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوۡجَيۡنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰ﴾ **النَّجم: ٤٥.**

✡ **أَمّا مِنْ ناحِيَةِ الكَيْفِ، فَقَدْ قالَ تَعالى:** ﴿مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ رِجَالٌ﴾ **الأَحْزاب: ٢٣. وَلَمْ يَقُلْ كُلُّ المُؤمِنينَ، مَعَ أَنَّهُمْ جَميعاً ذُكُورٌ، فَتَنَبَّهْ !!.**

**وَ قالَ تَعالى:** ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ﴾ **النِّساء: ٣٤. وَ لَمْ يَقُلْ: الذُّكورُ قَوّامُونَ عَلى النِّساءِ.**

✡ **الرُّجُولَةُ وَ السِّنُ: الحَقيقَة أَنَّ السِّنَ لا عَلاقَةَ لَهُ بالرُّجُولَة، فَرُبَّما كانَ الطِّفلُ بِصِفاتِهِ رَجُلاً، وكانَ الرَّجُلُ بِصِفاتِهِ طِفْلاً صَغيراً. المَرْءُ بِأَصْغَرَيْه: قَلْبِهِ وَ لِسانِهِ.**

❁ **قالَ اللهُ تَعالى:** ﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُطَّهِّرِينَ﴾ **التوبَة: ١٠٨.**

❁ **وَقالَ اللهُ تَعالى:** ﴿رِجَالٌ لَّا تُلۡهِيهِمۡ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيۡعٌ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ﴾ **النُّور: ٣٧.**

❁ **وَ قالَ تَعالى:** ﴿وَجَآءَ رَجُلٌ مِّنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ يَسۡعَىٰ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ ٱلۡمَلَأَ يَأۡتَمِرُونَ بِكَ لِيَقۡتُلُوكَ فَٱخۡرُجۡ إِنِّي لَكَ مِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ﴾ **القصص:** ٢٠.

✿ **قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (لَيْسَ الشَّديدُ بالصُّرَعَةِ، إِنَّما الشَّديدُ الَّذي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الغَضَبِ). متفق عليه.**


**سەرچاوەکان:**

١) **رَوْضَةُ الخُطَباء، مصطفى مُراد، ص١٨٥.**

٢) **هەڵوێستەکان، عبدالرَّزاق عبدالرَّحمن تەویڵەیی، ل١٢١ (باسی عەزیز نەسین و پڕۆژەی خێرخوازی).**

٣) **گۆڤاری (پزیشك)، ژ: ١٠، حوزەیرانی ٢٠١١، ل١٦ (باسی چاندنی جگەر).**

٤) **گۆڤاری (پزیشك)، ژ: ١٠، حوزەیرانی ٢٠١١، ل١ (باسی خوێن بەخشین).**

٥) **هەفتەنامەی (یەکگرتوو)، ژ: ٨٤٤، لە ١٢ / ٦ / ٢٠١١، ل٧ (باسی نەخۆشی تالاسیما لە کوردستان و پێویستیان بە خوێن).**

٦) **زنجیرەی ژیان و ئیعجاز، بەدیهێنانی مرۆڤ، سەروەر حەسەن، ل٤٤، ل ٥٣، (باسی سوڕی خوێن و دڵ)، وە (باسی پەنکریاس و شەکر لە خوێندا) ل٥٥، ل٥٩.**

٧) **بەهاری دڵان، ئەندازیار عُثمان، ل١٦٧ (باسی حەپسە خانی نەقیب).**




## پێوەرە هەڵەکانی کەسێتی

بەڕاستی وشەی مەردایەتی و کەسایەتی، ئاواتی ناو دڵی هەموو مرۆڤێکە کە ڕەوشتە جوانەکان تیا بدرەوشێتەوە، کە سەرفرازی بێت بۆ خۆی، بۆ خێزانی، بۆ بنەماڵەی، بۆ هاونیشتیمانیانی.

قورئان کە باسی جنس دەکا وەکو نێر و مێ دەفەرمووێت: ﴿وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوۡجَيۡنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰ﴾ هی واهەیە نێرینەیە، بەڵام مەردایەتی تێدا نیە، قورئان دەفەرمووێت مرۆڤەکانمان کردووە بە نێرو بە مێ. پاشان کە باسی مەردایەتی دەکات دەفەرمووێت: ﴿مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ رِجَالٌ﴾ لە ناو پیاوانی ئیمانداردا کۆمەڵە مەردێك هەن، ڕاستە ئەوان هەموویان نێرینەن، لە جنسی پیاون، بەڵام هەموویان مەرد و پاڵەوانی مەیدان نین. مەردایەتی پێك نەهاتووە لەبەهێزی لاشە، لەوەی کەوا مرۆڤ بۆیە مەرد بێت لەبەرئەوەی کەوا توانای جنسی بەهێزە، چونکە ئەگەر سەیری توانای جنسی مرۆڤ بکەین، سەیر دەکەیت چۆلەکەیەك زۆر لە ئینسانێك لە ڕووی جنسەوە بەهێزترە!

ئەگەر تەماشای هێزی بازوو پتەوی ماسولکە بکەیت، بڵێی مادام ئەو مرۆڤە ئەوەندە بازوو عەزەڵەی بەهێزە بۆیە مەرد و پاڵەوانە، بەهەڵەدا دەچیت، چونکە سەیر دەکەیت ئەگەر تۆ مرۆڤیت، پێستەکەت لە شوێنێکدا ئەگەر زۆر ئەستور بێت دوو ملیمە، بەڵام سەیر بکە فیل پێستەکەی بیست و پێنج ملیم ئەستورە، کەواتە ئەو زۆر لە تۆ بەهێزترە!

خۆ ئەگەر سەیری ئەوە بکەیت بە بالآی بەرز و گەردنی بەرز بێت، خۆ زەڕافە زۆر لە مرۆڤ گەردنی بەرزترە و بالآی بەرزترە، خۆ ئەگەر بەڕیش و سمێڵی زۆر بێت دەتوانی بڵێی ڕیشی بزن‌و سمێڵی شێر لە مرۆڤ گەورەتر و بەرزترە.

## کەسایەتی مرۆڤ لەچیدا دەردەکەوێت؟

**یەکەم: ئەوانەی ناخیان پاك دەکەنەوە**

کەسایەتی مرۆڤ لەوەدا دەردەکەوێت کە قورئان باسی دەکات، قورئان لەچەند شوێنێکدا وشەی (رِجال) بەکاردێنێت (رَجُل) بەکاردێنێت، ئینسانی مەرد و بە شەخسیەت و پاڵەوان و مەردی مەیدان لە قورئاندا بە (رَجُل) ناونراوە، (رَجُل) بە مەعنا ئەوە نیە نێرینە بێت، بەڵکو بە مانای مەردایەتی دێت لە قورئاندا، خوای گەورە یەکەم شوێن کە ئاماژەی پێدەکات ئینسان ئەگەر بیەوێت مەردی مەیدان بێت، ئەگەر لە ڕیزی شۆڕە سواران بێت، با ئەهلی مزگەوت بێت.

بەڵام چۆن ئەهلی مزگەوتێك؟! هەر ئەوەنیە ئینسان بێتە مزگەوت. چونکە قورئان دەفەرمووێت: ﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ﴾ دەفەرمووێت: لەناو مزگەوتدا کۆمەڵە مەردێك هەن، یەعنی ئەوەی کە دێتە مزگەوت ئەگەر ئەم سیفەتەی تێدا نەبێت بەر سیفاتی مەردایەتی ئەهلی مزگەوت ناکەوێت، ئەویش ئەوەیە (يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْ) کە لەماڵەوە بە ڕێ کەوت و دەرگای مزگەوتی کردەوە، بەو نیەتە دێت کەخۆی پاك بکاتەوە.

چۆن بەدەستو خۆشۆردنو جلو بەرگی پاكو خاوێنی لەبەردایە، هەوڵدەدات ناخیشی خاوێن بكاتەوە لەمزگەوتدا، بەو نیەتەوە هاتووە، بڵێ: خوایە هاتومەتە ماڵەكەت، بە كۆڵێك گوناهباریەوە هاتووم و بە كۆڵێك لێبورنەوە (مەغفیرەتەوە) برۆمە دەرەوە.. بەڵام بەداخەوە هەندێ كەس لە مزگەوتدا خۆی گوناهبار كردووە، بە چی؟! بەوەی كە گوێ بیستی دوو سێ وشەی حەق بووە، لەشوێنێك، كە بەپێوەری ئەم قسەكانی دژی كۆمەڵگەیە، بۆیە دەچێ راپۆرتێك لەسەر مامۆستای مزگەوتەكە بدات.

یان هەندێ كەس دەستێكی خێریان هەبووە لە ئاوەدانكردنەوەو بنیادنانی مزگەوت خۆیان كردوە بەسەرپەرشتیاری مزگەوتو ئەو خێرەش كردویانە لەدەستیان داوە چونكە رۆڵی مامۆستاو سەرپەرشتیاران بێ بەها سەیر دەكەن.. بۆیە ئەبێ بێت لە مزگەوتدا گوناهباریەكانت فرێ بدەیت، بەرگێكی خاوێن لەبەر بكەیت، ئەو سینەیەت كە پڕیەتی لە كینە بەرامبەر بە براكەت كە لە مزگەوتدا بینیت لێی ببوریت، با ماڵی خوا باشترین شوێنی صوڵح و صەلاحەتمان بێ. بە بێ كۆبونەوەو بە بێ قسە، هەر بەوەی كە سەلاممان لەیەك كرد، ئیتر كۆتایی پێ بێت، ئەمە مەردایەتی ناو مزگەوتە، كە خوا دەفەرموویت (فِیه رِجَالٌ) لەناو مزگەوتدا كۆمەڵە مەرد و پاڵەوانێك هەن.

دووەم: ئەوانەی گیانی خەڵكی رزگار دەكەن:

كە خوا لە قورئاندا باسی مەردایەتی دەكات، باسی ئەو كەسانە دەكات كە گیانیو رۆحی خەڵك دەپارێزن، لەپێناوی مانەوەی كەسێك، كە پیلانی كوشتنی

بۆ دادەنرێت تۆ ئاگات لێیەتی، گوێ بیستی ئەم هەواڵە بوویت، کەسەکە زۆر بەناحەق دەیانەوێت بیکوژن.. جاری واهەیە ئافرەتێکە، بە فکرێکی عەشایەری‌و بە بوختانی بوختانچیەك بیکوژن. دەڵێن فلان کوڕ و فلان کچە بەیەکەوە بینراون، لەڕووی شەرعەوە ئەمە بوختانە! چونکە کەسێك ناتوانێت دەست بە قورئاندا بدات، چوار شاهید بڵێن بەو چاوەی خۆمان بینیمان فلان کەس و فلان کەس زینایان دەکرد، بەم بوختانە، بەم قسە و قسەلۆکە، هەبووە ئافرەتەکەی بردووە لەو دەشتە کوشتویەتی!

گەر ئەم کەسە زیناکەشی کردبێت، هێشتا شایانی کوشتن نیە بە گولە ڕەجمی بکەیت، لە دەشتا فڕێی بدەیت، قەل و داڵ بیخوات. مرۆڤ لەوە گەورەترە، لەبەر ئەوە کەسێك گەر ئەم هەواڵەی زانی یان ئاگاداری ئەوە بوو پلان هەیە بۆ کوشتنی کەسێ یان گرتنی بەناهەق چەند خێرێکی گەورەیە ئەم دەنگ و باسە بگەیەنیت، بڵێی فلان کەس خۆت ڕزگار بکە، خۆت بەماڵی فلان گەورە و پیاو ماقوڵدا کە، خۆت تەسلیم بە دادگایەك بکە، بڕۆ پەنا بۆ شوڕتە و ئاسایش بەرە، بەڵکو ئەم کێشەیەت لە ڕێیەکەوە کۆتای پێبێت و خوێنت بە ناحەق نەڕژێت، خۆت ڕزگار بکە وولآتەکە بەجێبهێڵە.

## مەردێك حەزرەتی موسا ڕزگار دەکات

سەیری قورئان بکەین ئەو کەسانەی کە گیانی خەڵك ڕزگار دەکەن لە کوشتن، دەفەرموێت: زۆر مەردن، زۆر پاڵەوانن، ئەوانە دەبێت بە چاوی ڕێزەوە لە کۆمەڵگادا سەیریان بکرێت. قورئان باسی ئەو کاتەمان بۆ دەکات کە لە

کۆشکەکەی فیرعەونی زاڵمدا، کۆمەڵێك سەربازو دەسەڵاتدار کۆبوونەوە، پیلانیان بۆ کوشتنی حەزرەتی موسا دادەنا (سەلامی خوای لەسەر بێت). موسای بێ تاوان، موسای ڕزگارکەری مرۆڤایەتی، موسایەك کە دەڵێت نابێت کەسێك خوابێتو کەسێك عەبد بێت، هەموو هەر عەبدی خواین ین، هەر یەك خواهەیە ئەویش (الله) یە، بەس ئەمە تاوانی حەزرەتی موسا بوو لای دارو دەستەی فیرعەون، ئەی فیرعەون تۆ هەشت ڕۆژە ڕێگات بەدەستەوەیە[٢]. چۆن دەڵێی خوای ئەرز و ئاسمان منم، ئەمە تاوانە! ئەمە ستەمە لە خۆت و لە خەڵك.. لەسەر ئەم قسانە فیرعەون پێی قبوڵ نەکرا و وتی: ئەبێ موسا بکوژرێت، بەڵام چۆن بیکوژین، چۆن لەناوی بەرین؟

ڕاوێژی بە دەستە و دائیرەکەی دەکرد.. پیاوێك لەبەر دەرگا دانیشتبوو گوێ بیستی ئەم قسەیە بوو، پیلان بۆ کوشتنی حەزرەتی موسا دادەنرێت، لە کۆشکەکە خۆی دزیەوە و نیوە شەوێکی تاریکە، هات بۆ ماڵی حەزرەتی موساو لەدەرگای دا، بە ڕاکردن پێی وت: گیانت لە مەترسیدایە!

ئەم پیاوە خۆیشی گەر پێی بزانرایە کە هەواڵی کۆشکی بردوەتە دەرەوە، سزای کوشتنی بەسەردا دەسەپێندرا! بەڵام ئەم پیاوە مەرد بوو، وتی: ئەم پیاوە هیچ خراپەیەکی بۆ ئەم خەڵکە نیە، تەنها ڕێی باشەی نیشان داوین، تەنها فیرعەونی ئاگادار کردۆتەوە کە خۆشی بە هیلاك دەچێت و میللەتەکەش، بۆیە کەگوێ بیستی ئەم پلانە ژەهراویە کوشندەیە بوو، خۆی گەیاندو لەدەرگای ماڵی حەزرەتی موسای دا و ئاگاداری کردەوە..

---

[٢]- نێوان مەدیەن کە حەزرەتی موسا ڕایکرد بۆی، لەگەڵ وڵاتی میصردا، هەشت ڕۆژە ڕێگایە.

(سبحان الله) قورئان ئەو مەشهەدە مەردایەتیە تۆماردەکات، دەفەرموویّت: ﴿وَجَآءَ رَجُلٌ مِّنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ﴾ (رَجُلٌ) پیاویّك، مەردیّك، مەردیّکی مەیدان هات، لیّرەدا ناو گرنگ نیە، چونکە ئەمە لە هەموو زەمانیّکدا دووبارە دەبیّتەوە..

لە قورئاندا هەر کاتیّك ناوەکەی نەهیّنا، مانای ئەوەیە تا رِۆژی قیامەت نمونەی ئەم پیاوە باشە هەر دەمیّنیّت لە کۆمەڵدا.

لە کویّوە هاتبوو؟! (مِّنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ) گەر سەیری قورئان بکەین: (أَقۡصَا) بە ئەلفی دریّژ نوسراوە، نافەرموویّت (أقْصى) بە (ئەلفی مەقصورە) و ئەلفیّکی لەسەر بیّت، (أَقۡصَا) بە ئەلفی دریّژ، واتە ریّگاکە زۆر دوور بوو، زۆر بەینیان هەبوو، ماڵی حەزرەتی موسا لەو سەری شار، کۆشکی فیرعەون لەوسەر، ریّگاکە زۆر تاریك بوو، کەندەڵان بوو، زۆر سەختبوو، بۆیە دریّژی دەکاتەوە: (أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ) زۆر ریّگایەکی دوورو دریّژی بری..

بە رِۆیشتنی ئاسایی نەدەرِۆشت، قورئان ئەوەش تۆمار دەکات، هەنگاوەکانی چۆن هەڵیّناوە، ئەم مەردە (يَسۡعَىٰ) بەپەلە دەرِۆیشت، هەنگاوی دەنا، بازی دەدا لەسەر ریّگاکە، (يَسۡعَىٰ) نافەرموویّت: (يَمْشي). (يَمْشي) جیاوازە لەگەڵ (يَسۡعَىٰ)دا، لە قورئاندا دەفەرموویّت: هەنگاوەکانیشی پیرۆز بوو، کە گیانی کەسیّکیشی لە مردن رِزگار دەکرد، خۆی گەیاندە ئەوو، وتی: ﴿قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ﴾ هەر دەرگای کردەوە بەپەلەو وتی ئەی موسا: ﴿إِنَّ ٱلۡمَلَأَ يَأۡتَمِرُونَ بِكَ﴾ ئەوە دامو دەزگاکەی فیرعەون، دەسەلآتو سوڵتە کۆبۆتەوە: ﴿لِيَقۡتُلُوكَ﴾ پیّشت بڵیّم

بۆچی؟ کۆبونەوە، بۆ ئەوەی تۆ بکوژن! پیلانی کوشتنیان داڕشتوویت، ﴿فَٱخۡرُجۡ﴾ هەر ئێستا، هەر ئەمشەو، (فای تعقیبە)ی لەسەرە، خۆت کۆبکەرەوە و ئەم شارە بەجێ بهێڵە.

﴿إِنِّي لَكَ مِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ﴾ بەخوا من دڵسۆزی تۆم، من دڵسۆزی تۆم، ئامۆژگاریکەرێکی ئەمینم، ئەوەی بە گوێی خۆم بیستومە بەتۆم گەیاندووە، ﴿فَٱخۡرُجۡ﴾ هەر ئێستا هەستە بار بکە، لە وڵاتەکەت دوور بکەوە، پەنا بۆ شوێنێك بەرە، سەر زەوی خوا فراوانە، گیانی خۆت ڕزگار بکە، خوای گەورە ئەم مەشهەدە تۆمار دەکات. نافەرموێت چ پیاوێك، ناوی چی بوو، بەڵام مەرد بوو، گیانی حەزرەتی موسا پێغەمبەری ڕزگار کرد.

زۆر بوون لە میللەتی کوردیشدا، کە ئاوا مەرد بوون، کەنەیان هێشتووە خوێنی خەڵك بڕژێت، کە پەنای خەڵکی بێ تاوانیان داوە، ئەوانە خوا بە مەرد ناویان دەبات، بە پاڵەوان ناویان دەبات، بە شەخسیەتدار ناویان دەبات، مەفهومی مخالەفەکەشی ئەوەیە: هەر کەسێك بە ڕاپۆرتێکی بەدرۆ، بە جاسوسی کردنێکی بەدرۆ، ملی کەسێك بە پەتا دەکات، نامەردترین کەسی سەر زەویە، ئەوەی کە ڕۆحی کەسێکی بێ تاوان دەکێشێت بە ناحەق، نامەردترین کەسی سەر زەویە، ئەوە قورئانە، وا دەفەرموێت.. ئەمەی کەباسکرا ڕزگارکردنی کەسێك بوو بەگەیاندنی هەواڵێك، دەکرێ ئێمە بە شێوازی دیکە یارمەتی خەڵك بدەین و ڕزگاریان بکەین.

## مەردایەتی بەماڵ بەخشین

خوا گەلێك بەهرە و خەلاّتی بە مرۆڤ بەخیشوە، بۆ نمونە دەتوانی بە ماڵ، بە ماڵ گیانی خەڵك ڕزگار بکەیت، تۆ جاری واهەیە خوای گەورە ماڵ و سەروەت و سامانت دەداتێ، کەسانێك سەرگەردان دەبن بە ماڵی تۆ زیندوو دەبنەوە. نمونەیەك: پیاوێکی وەکو (عزیز نەسین) کە کەسێکی چیرۆك نوسو ڕۆمان نووسە، خاوەنی هەشتا کتێب و ڕۆمان و چیرۆکی بچوکە، بە (بیست) زمانی سەر زەوی کتێبەکانی وەرگێڕدراون، خەڵکێکی زۆر لێ سودمەند بووە..

خۆی بەڕەگەز تورکە، بەڵام زۆر دۆستی میللەتی کورد بووە، لە ستەمدیدەیی میللەتی ئێمە بەرگری کردووە، بۆ زمانی کوردیش چەندین کتێبوناملیکەی وەرگێڕدراوە.. ئەم پیاوە بەقەدەر ئەوەی بە نوسینەکانی بەناوبانگە، سەد قاتی ئەوە مەردی مەیدانیەکەی بەوە خۆشەویست بووە لە دڵی هەمووماندا، کاتێك سەروەتو سامانەکەی هەمووی کۆکردەوە، ساڵی (١٩٧٨ز) لە تورکیا، هەرچی پارەو سامانی هەبوو، هەموو کەل و پەلەکانی، خانووەکانی، ئوتومبێلەکەی، هەمووی فرۆشت.. یەك کۆشکی گەورەی پێ دروست کرد، بینایەکی چەند نهۆمی.

نهۆمی یەکەم بۆ شانۆ، کەوا مەسرەحیاتی تیا بکەن، چیرۆکەکانی بکەن بە شانۆییو دەرسیان لێوەربگیرێت. نهۆمی دووەم بۆ کتێبخانەی گەورە، ئەوانەی زانست خوازن بێن لەو شوێنەدا بخوێننەوەو توێژینەوە بکەن. نهۆمی سێهەم چەندین ژوورێکی زۆر بوو، بەشێوەیەکی جیاواز دروست کرابوو، دەگەڕا بۆ ئەو منداڵانەی کە باوکیان مردووە، کە دایکیان شووی کردۆتەوە و کەس نیە

بەخێویان بکات، هەیە دایك و باوکی مردووە، هەیە لەکۆڵان فڕێ دراوە، کەس نازانێت کێ دایك و باوکیەتی!

ئەم پیاوە مەردە هات هەموو ئەم منداڵانەی کۆکردەوە، خزمەتکاری بۆ گرتن، مامۆستای پیاو و ئافرەتی بۆ بە کرێ گرتن، لەسەر سەروەت و سامانی خۆی بەڵێنیدا ئەمانە دەبێت بە جوانترین پەروەردە، بە باشترین خزمەت خزمەت بکرێن، هەمووشیانی ناردنە بەر خوێندن، لە سەدا حەفتاشیان زانکۆشی پێ تەواو کردن، هەموویانی خستە خزمەتی کۆمەڵگاوە!

ئەوە مەردایەتیە، ئەوە بەهەشتی خوا بۆ خۆی دەکڕێت.. ئەوە بەقەدەر ئەوەی قەڵەمی هەیە، بە ماڵەکەشی بوو بە مەردی مەیدان.

## بەخشینی ئەندامی لاشە

یەکێکی تر لەو بوارانەی خوای پەروەردگار مەردایەتی لە ڕێگایەوە بە مرۆڤ دەبەخشێت، ئەندامەکانی لاشەی خۆتە، خوای گەورە دەرگایەکی لەسەر ئەم ئینسانە کردۆتەوە، دەتوانی بەم لاشەیەی خۆت، یارمەتی خەڵکی بدەیت ئەگەر پارەشت نەبێت، ئەگەر خزم و کەس و کاریشت نەبێت، بەڵام مەرد بیتو خاوەن کەسایەتی بیت. بۆ نمونە بەشێك لە لاشەی خۆت دەتوانی بە کەسێکی تر ببەخشیت، گورچیلە خوا مرۆڤی وا دروست کردووە بەیەك گورچیلە دەتوانێت بژی، چەند کەس هەیە گورچیلەی خۆی دەبەخشێت بە کەسێکی تر، بە پارە نا بەڵکو (فی سبیل الله) لە مردن ڕزگاری دەکات.. جا ئەگەر ژنەکەی خۆت بێت، ئەگەر براکەت، یان خوشکەکەی خۆت بێت، هەر مەردیت! بەڵکو بۆ خزمەکەی

خۆت لە خەڵك خێری زیاترە، ئێستا چاندنی جگەریش هەیە، جگەر ئازیزترین پارچەی لەشی مرۆڤە، دەتوانرێت بەشێكی بەخشرێت..

سەرەتای ئەم كارەش دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٨٩) لە ئەمریكا ئافرەتێك یەك منداڵی هەبوو، منداڵێكی چاوگەشی تا بڵێی جوان، نەخۆش كەوت، لاشەی بچوك بوویەوە.. دكتۆرەكان پشكنینی تەواویان بۆ كرد، سەیریان كرد جگەری ڕزیوە! هیچ پەنایەك نەبوو، ئەم دایكە پێشنیاری كرد وتی: من جگەری خۆم لێدەكەمەوە بۆ ئەم منداڵەم، با من بمرمو ڕۆڵەكەم نەمرێت، ئەم سۆزەی ئەم دایكە، ئەم خۆشەویسی بەینی دایكو ئەولادە!

دكتۆرەكان وتیان: نا مادام تۆ ئەوەندە لێبوردە بیت، با ئێمە تاقیكردنەوەیەك بكەین، نیوەی جگەرت دەبڕین، زەرعی دەكەین لەسەر جگەری ئەو منداڵە، ئەگەر دەرچوون، هەردووكتانن، ئەگەر مردن با هەردووكتان بمرن..

چاندنەكەیان بۆ كرد، بۆیان دەركەوت دایكەكە لەماوەی یەك دوو حەفتەدا جگەری وەك خۆی لێهاتوەتەوە، دروست بۆوە! منداڵەكەش ئەو خانانەی دایكی هەڵمژیو جگەرەكەی وەك جاران دروست بوویەوە! ئەم ڕووداوە بوویە سەرەتایەك ئێستا ساڵی (شەش هەزار) نەشتەرگەری چاندنی جگەر لە ئەمریكا دەكرێت.. ئەمەش بەهۆی دڵسۆزی دایكێكەوە.



## بەخشینی خوێن

یەكێك لەو بابەتانەی ئەمڕۆ زۆر بڵاوەو خەڵكی یارمەتی یەكتری پێدەدەن: خوێن بەخشینە، كەلە ساڵێكدا ڕۆژێكی بۆ دانراوە كە(٦/١٤)ە، كە بەڕۆژی خوێن بەخشین ناونراوە لەجیهاندا.. ڕۆژی ئەوەیە كەسێك بە خوێنی تۆ، جارێكی تر ڕۆحی بەبەردا بكرێتەوە، ئەزانن بۆچی چواردەی شەش هەڵبژێردراوە، بۆچی ئەم ڕۆژە؟! لەبەرئەوەی زانای بەناوبانگی جیهانی (كارل دانیشتاینی) ئەم زانایە، كارل هات كە خەڵاتی نۆبڵی وەرگرتوە، داهێنانی ئەوەی كرد: گروپەكانی خوێنی دیاری كرد، گروپی خوێن ئەوەیە تۆ (A-) ئەو (A+) ئەو (O+) ئەو (B-)، ئەم زانایە بوو ئەم داهێنانەی لەبواری خوێندا دۆزیەوە، سەرەتایەك بوو بۆ ئەوەی خەڵك خوێنی یەكێك بكەنە یەكێكی ترەوە، خەڵاتی جیهانی پێ بەخشرا كە نۆبڵە!

لەوە گەورەتر هەموو ڕۆژێكی چواردەی شەشیان كرد بە ڕۆژی جیهانی خوێن، بەخشین بۆ كارل لەبەر ئەوەی ئەم زانایە لەم ڕۆژەدا لەدایك بووە، ئەو داهێنانە گەورەی لەبواری خوێندا دۆزیەوە، بوە هۆكاری ئەوەی سەدان هەزار خەڵك بە خوێنی یەكێكی دیكە گیانیان لە مردن ڕزگار بكەن.

ئەوە بەهرەمەندیە، ئەوە شەخسیەتە، خۆ ئەگەر ئەم پیاوە مسوڵمان بوایە هەتا ڕۆژی قیامەت هەر كەسێك ببێتە هۆی خوێن بەخشین، ئەم لە ئەجرەكەیدا بەشدار دەبوو، بەداخەوە بەكافری مرد، بەڵام لە قیامەتدا، خوا ئەو ئەجرەی هەر دەداتەوە، بەقەدەر هەموو بتڵە خوێنێك كە لەم سەرزەویە دەبەخشرێت، خوا

عەزابی دۆزەخی لەسەر سووك دەكات. هێشتا پاداشتی هەر هەیە، ناچێتە بەهەشت چونكە خۆی نەیدەویست..

لە ڕۆژنامەیەكدا باسی كابرایەكیان كردبوو، ئەو مەردی مەیدانە زۆر هەژارو فەقیرەو كرێكارە، كەچی تا ئێستا (حەفتا و پێنج) بتڵ خوێنی بەخشیوە! حەفتاو پێنج كەس بە خوێنی ئەم لاشەیان بوژاوەتەوە.. ڕۆژانە بە هەزاران خەڵك گیانی دەكەوێتە مەترسیەوە، تۆی بەڕێز دەتوانی خۆت فەحس بكەیت، ئەگەر بە بتڵە خوێنێكیش بێت لەو ڕۆژانە دا لە دەرگای مەردایەتی و كەسایەتی بدریَو ناوی خۆت لای (رب العالمین) تۆمار بكەیت، (رَجُلٌ مُهمة یهدي اللهُ به الأُمة) لە كۆنەوە گوتراوە: پیاوێكی بە هیمەت دەتوانێت ئومەتێك ڕزگار بكات..

ئەمڕۆ لە كوردستاندا، هەر لە شاری هەولێرو دەوروبەری لە پایتەختی هەرێمدا پێنج سەدوده منداڵ نەخۆشی تالاسیمایان هەیە، كە بەردەوام دەبێت خوێنیان پێ بدرێت.. بەڕێوەبەری خەستەخانەی هەولێر وتوویەتی، هەموو حەفتەیەك دوو سەد بتڵ خوێنمان دەوێت،!!

لە سلێمانیشدا هەشت سەدو چلو حەوت حاڵەتی (تالاسیما) هەیە بەردەوام خوێنیان پێ دەدرێت. وە بەردەوام خەستەخانەكانی دیكەش داوای خوێن دەكەن. لەو حاڵەتە ناچاریانەدا بەڕۆژانە بە چەند بتڵ خوێنیان دەوێت، بە تایبەت ئەو خوێنانەی كەوا (+A) (-A) (-AB) ئەمانە ناقسن زۆر كەمن دەست كەوتنیان زەحمەتە.

بۆیە خوێن بەخشین یەكێكە لە مەیدانی مەردایەتی، كە زیان بە خوێن بەخشەكە ناگەیەنێت، بەڵام بە چەند مەرجێك: تەمەنت نابێت لە حەڤدە ساڵ كەمتربێت، نابێت لە شەستو شەش ساڵ زیاتر بێت، نابێت پلەی گەرمی لە سیو

حەوت پلەو نیو بەرزتر یان نزمتر بێت، واتە کەسەکە نابێت تای هەبێت، نابێت دوومانگو نیو کەمتر بێت خوێنت بەخیشبێت، ئەبێ کێشی لاشەت ئەوەندە لاواز نەبێت لە پەنجا کیلۆ کەمتر بێت.. نابێت نەخۆشی شەکرەو زەخت و زەردووی و مەلاریا و ئایدز و سیل و شێرپەنجەت هەبێتو، لێیان پاك بیت.

ئەمەش بەهۆی چیەوە دەکرێت؟! پێم خۆشە ئاماژە بەو خوێنە بکەین کە ئێمە بەهۆی خوێنەوە لاشەمان دەجولێت، کۆئەندامی سوڕانی خوێن هەیە لە لەشدا، کە لە یەك دەقەدا حەفتا و دوو جار خوێن دەنێرێت! ئەزانن چەند جادە دەبڕێت، بە شەقامە گشتیەکانو فەرع و کۆلانەکانەوە، تا دەچێتە یەك بە یەکی ماڵەکان، (١٥٠) هەزار کیلۆمەتر دەتوانی بەسەر هەموو زەویدا بسوڕێیتەوە، ئەگەر شارێکی وات نەبیستووە زۆر لێت نزیکە، ئەم جەستەیەی خۆمانە! مزەخەکەی دڵتە، شانەکان جادە و ڕێگا و بانەکانن، ئەو شاخوێن بەرو دەمارە وردانەن بە هەموو لەشتدا دابەش بوون، شوێنێك نیە دەماری خوێنی بۆ نەچووبێت..

## ڕاستیەکی زانستی:

زاناکان هاتون توێکاریان کردووە، جەستەی مردوویەکیان هێناوە، دەمارەکانیان هێناوە، لەدەماری گەورەوە بۆ ورد کۆی گشتی هەموو دەمارەکان گەیشتۆتە: سەد و پەنجا هەزار کیلۆمەتر دەماری خوێن لە یەك دەقەدا حەفتا و دووجار ئەم دڵە لێدەدات، خوێن کە ئاوی تێدایە، ئۆکسجینی تێدایە، خۆراکی تێدایە، شەکری تێدایە، بۆ ئاخر ئەندامی دەینێرێت، واتە بۆ ئاخر ماڵ، چونکە

سەد ملوێن خانە و ماڵ لەناو لاشەی تۆدا هەیە هەر هەمووی خۆراکی پێدەگات، پێشی دەڵێت: لەماوەی ئەو دەقەدا حەفتا و دووجار لە دەرگات دەدەم و خواردنو ئاوت دەدەمێ، پیسیەکەش فڕێ مەدە بۆم بنێرەوە، ئەو دڵە کە ماتۆڕەکەیە، بە دوو پەردەی تەنك دەورە دراوە، دڵ بۆ خۆی بە خوێن ئیش ناکات، هەموو لاشەت بە خوێن ئیش دەکات.. دوو پەردەی تەنك لەدڵدا هەیە، بەقەدەر پەڕەیەکی تەنك دەبێت، لە نێوان ئەو دوو پەردە تەنکەدا شلەیەك هەیە، دڵ بەو شلەیە کار دەکات، ئەگەر ئەو ماددە شلە زۆر بێت دڵ دەست دەکات بە تەپە تەپو، زۆرتر لێدەدا، دڵت ناڕەحەتە، ئەگەر ئەو شلەیە کەم بێتەوە، ئەوە هەست دەکەیت لەشت قورسە..

ئائەم دڵە بەهێزە، ڕۆژی سەد هەزار جار لێدەدات، سەد هەزار جار ئاو و خۆراك دەگەیەنێتە هەموو ماڵێکی ئەو لاشەیە، سەد هەزار جاری کیسە پیسیەکان وەردەگرێتەوە، جارێکی کە پاکیان دەکاتەوە، ئەگەر ئەم ژمارەیە بۆ تەمەنێکی ٦٠-٧٠ ساڵی حساب کەین ژمارەیەکی باوەڕ پێنەکراو دەردەچێت، خوای دروستکەر پشووی بۆدڵیش داناوە، بەڵام چۆن؟

لە شەش چرکەدا چرکەیەك پشوو دەدات، ئەگەر لە شەش دەقەدا یەك دەقە پشوت دابێت، هەڵنەدەسایتەوە، بە تێکڕایی دڵ لە شەو و ڕۆژێکدا چوار سەعات ئیسراحەتی خۆی دەکات، بە بێ ئەوەی تۆ هەستی پێ بکەیت، بۆ ئەوەی کەوا لەکار نەکەوێت بۆ ئەوەی پشووی خۆی وەربگرێت.

## پاسەوانی خوێن

پاسەوانێکی تایبەت هەیە بەسەر خوێنەوە ناوی پەنکریاسە،خودا بۆ ئەوە دروستی کردوە کە ڕێژەی شەکری خواردن دەزانێت چەندە؟ هەموو خواردنێك دەزانێت چەند دەنکۆڵە شەکری تێدا بووە، خوێن پێی دەڵێت بزانە بەقەدەر پێویستی لێوەربگرە، یەك یەك دەیانپێوێت لە کاتێکی زۆر کەمدا، دەڵێ ئەی خوێن تۆ ئەوەندە شەکرت پێویستە، ئەوەندەشی زیادە!

بە عەقڵی خۆی پەنکریاس خوا پێی بەخشیوە دەڵێ فرێی مەدە، نەوەك ڕۆژێك پێویستی پێی بێت، ئەمرێك بکە، کیتابێك دەربکە بۆ خانەکانی لەش، دەرگاکانتان بکەنەوە، ئەم شەکرە زیادەیە عەمبار بکەن لە شانەکانتان، ڕۆژێکیش کابرا شەکری نەخواردووە، دەستی نەکەوتووە یان لە خواردنەکانیدا نەبووە، خوای گەورە ئەمر دەکات ئەی پەنکریاس کیتابێکی ڕەسمی لە ڕێی ئەنسۆلینەوە بکە، بڵێ: دەرگاکانتان بکەنەوە، ئەوەی بە ئەمانەت چەند ساڵە پێمان سپاردوون، بیگێڕنەوە بۆ ناو خوێن، چونکە خوێن شەکری تێدا نەماوە!

ئەمە هەموو لە لاشەی خۆتدا ڕوودەدات دواتر شێوەی خڕۆکە سورەکانی ناو خوێن زۆر نەرمن، ئەوەندە نەرمن بە هەموو شوێنێکدا دەچن[٣]!

---

[٣] - خوێن بەو نەرمیە بۆ ئەوەی بگاتە هەموو شوێنێکی لاشە، خوا دروستی کردووە، ئەمجا ئەم شەبەکەیە ئەم هەموو جارە نابێت برینێکی تیدا بێت، چونکە ئەگەر برینێك دروست بێت ئەوە خوێنی هەموو لاشەمان دێتە دەرەوە، بەڵام خوا چارەسەری ئەوەشی کردووە، تۆ مرۆڤی، تۆ کرێکاری، ئافرەتە لەماڵەوە ڕۆژ تا ئێوارە شت ورد دەکات، چەقۆیەك بە دەستیەوەیەتی، تۆ ڕیشت دەتاشیت، سەرت دەتاشیت.. گوێزانەکەت بە حاڵ پیا دەکات، خوێن دێتە دەرەوە، خوا تەگبیری ئەمەشی کردووە، نابێت ئەم خوێنە یەکسەر فیچقە بکات، لەو کاتەدا پرۆتینێك لەخوێندا هەیە پێی

## مەردایەتی زنانی كورد

لە ڕووی مەردایەتیەوە مەبەستمان پیاو نیە، جیاوازی ژن و پیاو نیە، لە خێزانەكانی پێغەمبەری بەڕێزەوە ﷺ تا ئافرەتانی صەحابە، هەموو مەردی مەیدان بوون، هەموو ژیاننامەیان تۆماركراوە، لە كوردا ئافرەتی وەكو (حەپسەخان)ی نەقیبمان هەیە كە لە (١٩٥٣) كۆچی دوای كردووە، ڕەحمەتی خوای لێ بێت، ئافرەتێك بووە بە موقابیلی دەیان پیاو هەبووە، لەوەختی خۆیدا هەر كەسێك لە دەرگای ماڵی دابێت، نائومێدی نەكردووە..

ئەم ئافرەتە یەكێك لەو ڕێز و حورمەتەی كە دوای خۆی بەجێی هێشت، هەموو ساڵێك، هەموو ساڵێك مێردەكەی كە شێخ قادری ناو بووە، لە سلێمانیەوە ناردوویەتی بۆ بەغداد، بۆلای شێتەكانی سلێمانی! چەند شێت هەبووە لە سنوری پارێزگای سلێمانی هەمووی نێراون بۆ شێتخانەی بەغداد.. ئەنجا ئەوانەی تریش كە لە شێتخانەكانی ناردوویەتی هەموو ساڵێك جل و بەرگی تازەی بۆ كردوون، هەموو زستانێ نەوتی لەو بێ نەوتیەدا بۆ كڕیون، چەند دەرزی و دكتۆر و

---

دەڵێن (ڤۆن ویلیبران) ئەم پرۆتینە ئیشی ئەوەیە لەناو خوێندا، دائیرەی نەجدەیە، پۆلیسی فریاكەوتنە، بەردەوام لە لەشی ئێمەدا دێ و دەچێت، ئەگەر لە هەر شوێنێكدا برینێك دروست بوو، دەمارت بڕدرا، خێرا ئەمر دەكات پەڕەكانی خوێن كە لە خوێندا هەن، بۆ خۆی جارێك دەرگاكە دەگرێت، بۆئەوەی هیچی تر نەیەت، ئەمجا ئەمر دەكات، دەڵێت: سەد پەڕەی خوێنمان پێویستە، چونكە برینەكە تۆزێكە، سەد پەڕە دێت و دەرگاكە قەپات دەكات!

ئەگەر گەورەتر بوو دەڵێت دووسەد بێت، ئەگەر جاری واهەیە برینەكە گەورەیە دەڵێ فلان كەس نەزیف بووە، یەعنی ئەوەندە فرێدانی خوێنەكەی بەقوەتە و ئیشارەتی پۆلیسیەكەی بەهێزە، هەرچی خوێنی لەشە دێتە ئەو شوێنە، چونكە دەزانن برینەكە گەورەیە..

دەرمانیان بوێت پارەی بۆ ناردوون و بۆ ئەوەی شێتەکان کە کوردن و لە سلێمانیەوە ڕەوانەی شێتخانە کراون لەوێ بە بێ نازی تەماشا نەکرێن، ئەمەش خەڵکی هیمەت بەرز کەس بیری لای شێتی شێتخانە نیە ئەو ئافرەتە لە ماڵەوە بیری ئەوەی هەبووە، شێت لە شێتخانەدا کوردە و پێویستی بە هیمەتی ئەم هەیە.





# بەشی حەوتەم

# کەسایەتی مرۆڤی مسوڵمان

# لە قورئاندا

## خاڵە بنەڕەتیەکانی ئەم بەشە:

❁ **قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى:** ﴿قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ۝ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى صَلَاتِهِمْ خَـٰشِعُونَ ۝ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ۝ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَوٰةِ فَـٰعِلُونَ ۝ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَـٰفِظُونَ ۝ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ۝ فَمَنِ ٱبْتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْعَادُونَ ۝ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِأَمَـٰنَـٰتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَٰعُونَ ۝ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمْ يُحَافِظُونَ ۝ أُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْوَٰرِثُونَ ۝ ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ۝﴾ **المؤمنون:** (١ – ١١).

❁ **وقالَ اللهُ تَعالى:** ﴿وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَـٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَـٰمًا ۝ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَـٰمًا ۝﴾ **الفرقان: ٦٣ – ٦٤.**

❁ **وَ قالَ اللهُ سُبْحانَهُ تَعالى:** ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُوا۟ خَيْرًا مِّنْهُمْ وَلَا نِسَآءٌ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيْرًا مِّنْهُنَّ ۖ وَلَا تَلْمِزُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُوا۟ بِٱلْأَلْقَـٰبِ ۖ بِئْسَ ٱلِٱسْمُ ٱلْفُسُوقُ بَعْدَ ٱلْإِيمَـٰنِ ۚ وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ﴾ **الحُجُرات: ١١.**

✡ **قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (لَيْسَ المُؤمِنُ بالطَّعانِ، ولا باللَّعانِ، ولا الفاحِشِ ولاَ البَذِي). رَواهُ الترمذي، وَ أحمد، وَصَحَّحَهُ الألباني في صَحيح الجامع: (٥٣٨١).**

۞ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (إتَّقوا دَعْوَةَ المَظْلُومِ، وَ إِنْ كانَ كافِراً فَإِنَّهُ لَيْسَ دونَها حِجابٌ) رَواهُ أحمد: (١٢١٤٠). وَ حَسَّنَهُ الأَلْباني في السلسلة الصَّحيحَة: (٧٦٧).

۞ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (مَنْ نَزَلَتْ بِهِ فاقَةٌ، فَأَنْزَلَها بِالنّاسِ لَم تُسَدَّ فاقَتُهُ وَمَنْ نَزَلَتْ بِهِ فاقَةٌ فَأَنزَلَها بِاللهِ، فَيُشِكُ اللهُ لَهُ بِرِزْقٍ عاجِلٍ أَوْ آجِلٍ). رَواهُ الترمذي: (٢٣٢٦). وَقالَ حَسَنٌ صَحيحٌ.

## سەرچاوەكان:


١) قورئانى پڕ بەرەكەت و بەخشش.

٢) مِنْ القِصَص النبوي، محمد صالح المُنْجِد، ص١٨٠.

٣) الوَصايا المِنْبَرِيَّة. محمد عبدالعاطي بحيري، المجموعَة الثانِيَة، ج١، ص٤١٢.

٤) گۆڤارى (دوانگە)، ژمارە: ٤١، ل١٨.




کاتێك قورئانی پیرۆز دەخوێنیتەوە، سەیر دەکەیت باسی گەورەیی ئیماندار دەکات، بەڵام ئیمانداران نەك هەر بە مانای وشە، بەڵکو لە کرداردا ئیمانداری حەقیقی، یەك سورەتی گەورەی ئەم قورئانە پیرۆزەی ناوی سورەتی (المؤمنون)ە، سورەتی ئیمانداران. ئیماندار ئەوەندە بەڕێزە لای خوا! سورەتەکە بە ئایەتێك دەست پێدەکاتو دەفەرمووێت: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾ المؤمنون: ١. بەڕاستی بە بێگومان و دڵنیابن ئیمانداران براوە و سەرفرازن، بەڵام کام ئیماندار؟! ئەو ئیماندارەی کە کۆمەڵێك شەخسیەتی هەیە، چونکە ئیماندار ئێستە بە ووشەی مسوڵمان ملیارێك و سێ سەد ملوێن خەڵك هەیە، بەڵام لەناویاندا قورئان کۆمەڵێك هەڵدەبژێرێت. پێویستە هەوڵ بدەین لەو ئیماندارە بە شەخسیەتانە بین شایەنی ئەوە بین، (رب العالمین) لە قورئاندا ناومان بێنێت.

## سیفەتەکانی مرۆڤی ئیماندار:

### سیفەتی یەکەم: ﴿ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ ۝٢﴾

ئەوانەن، کە نوێژەکانیان بە دڵی بە ئاگاو ملکەچی بۆ خوا دەردەبڕنو، بەترسەوە نوێژ دەکەن، بەرامبەر بەخوا ئەهلی شەرمن.. بێگومان نوێژ خوێن زۆرە، بەڵام خوا دەفەرموێت: (خَٰشِعُون) ئەوەی کە لە کاتی نوێژەکەدا دڵی لە لای نوێژەکەیە، نەك دڵی لە بازاڕ بێت، ئەوەی لەکاتی نوێژەکەیدا ڕووی لە خوایە، نەك ڕووی دیسان هەر دنیا بێت و لە دەرەوەی مزگەوت بێت. ئەوە زۆر گرنگە، مەردایەتیە دڵت ئاگاداری نوێژ بێت وەك پێغەمبەر لەبارەی نوێژەوە بە(بیلال)ـی فەرموو( **یا بِلال أَرِحنا بِالصَّلاة**) واتە: ئادەی بیلال بە نوێژەکە بمانحەوێنەوە..

بۆیە شەیتان تا کۆتا سات دەیەوێت لە نوێژەکە دوورت بخاتەوە! شتی واهەیە هەر لەبیرت نیە، کەچی لەنوێژدا بە بیرت دەکەوێتەوە! ئەمە شەیتان دەیەوێت لەو مەردایەتیە داتبڕێت، تۆ ئەوەندە مەردبیت، ئەم دنیا و سەرقاڵیە بەم هەموو زۆریەوە لەو نوێژەدا بێ ئاگات نەکات، شایەنی ئەوەی مەردیت، کەسایەتیت بەهێزە، کە خوا باست بکات: ﴿ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ ۝﴾ جا ملکەچی هەرشێوە ڕوکەشیەکەی نیە، چۆنیەتی دەست گرتنو وەستانو.. بەڵکو ئەوەیە واهەست بکەیت خوای گەورەت لەبەرامبەردایە.

## سیفەتی دووەم: ﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنِ ٱللَّغۡوِ مُعۡرِضُونَ ۝﴾

ئەو مەردە ئیماندارانەی کە شەخسیەتیان بەرزە، خوا وەصفیان دەکات بەوەی لە هەموو کارو کرداری پڕو پوچو شتی بێماناو بێسود ڕوو هەڵدەسوڕێننو پشت هەڵدەکەن، لە هەموو قسەیەك کە (ٱللَّغۡوِ) بێت (ٱللَّغۡوِ) مانای ئەوەیە: زۆر بێ سودە، نە سودی بۆ دونیا هەیە، نە سودی بۆ قیامەت هەیە، بەڵکو زەرەریشی هەیە، زەرەر بە شەخسیەتی خۆتو خەڵکیش دەگەیەنێت، خوا دەفەرمووێت: (مُعۡرِضُونَ)، گەر سەیری قورئان بکەین زۆر وردە، نا فەرمووێت: بەرەورووی قسەی نابەجێ ناچن، هەیە بەدووی کۆڕی (لهو لعب) دا دەگەڕێت، حەزی پێیەتی. بەڵام ئەم ئیماندارانە ئەگەر ئەم کۆڕەشی (مجلس: لهو لعب) هاتەماڵەوە بۆی، ئەگەر یەخەشی پێگرت، (مُعۡرِضُونَ) ئەم پشتی تێدەکات!

زۆر گەورەییە غەیبەت نەکەیت، گەورەیی ئەوەیە غەیبەتت لەلا بکرێت و تۆ گوێی بۆ نەگریت و هەستیت مەجلیسەکە بەجێبهێڵیت. گەورەیی نیە بوختان نەکەیت، گەورەیی ئەوەیە بوختان بکرێت و تۆ بەدەمیدا بچیتەوە بڵێی خوا لێت هەڵناگرێت!

سیفەتەکە لەوەدایە، هەر پشتی تێدەکەن‌و ڕووی لێوەردەگێڕن، هەر کڕیاری ئەو ﴿ٱللَّغْوِ﴾ نین، ئەو قسە و قسەلۆکە نابەجێیانەی لەناو خەڵکدان، ئەمان بازاڕی ئەوەیان ناوێت، ئەمان کڕیاری ئەو کاڵا بێ نرخە نین.

## سیفەتی سێیەم: ﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ۝﴾

خوا دەفەرمووێت: بەڕاستی ئەوانەش زەکاتی ماڵیان دەبەخشن، وەکو بڵێی زەکات دروستکەرن.. زۆر کەس زەکات دەبەخشێت، بەڵام هەموو کەس ئەو مەردە نیە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَٰعِلُون﴾ ئەوەندە دڵی بە زەکاتەکە خۆشە، وەکو ئەوەی خوا تەنها لەبەر خاتری دڵی ئەو زەکاتی دانابێت! چەندە پیشەکەی پێخۆشەو سەرمایە کۆدەکاتەوە، بەقەدەر ئەوەو زیاتر پێی خۆشە کە زەکات دەدات. قورئان وا تەعبیرەکە دەردەبڕێت: ﴿فَٰعِلُون﴾، واتە: وەکو ئەوەی بڵێت: خوایە بۆیە کاسپی دەکەم، بۆیە حەزدەکەم دەوڵەمەندبم، لەبەر خاتری ئەوەی زەکات بدەم، ئەوەندە بە دڵگوشادیەوە زەکاتەکە دەدات، ئەوەندەی پێخۆشە، ئەوەندە دوورە لە منەت و بەچاوێنی و باسکردنەوە..

بەلاّم هەندێ کەس لە حیلە شەرعیەك دەگەڕێت، دەپرسێت: ئەرێ مامۆستا زەکاتەکەم نەدەم بە کوڕەکەم؟! بەڵکو ئەم دوو دینارە زەکاتەشم لە دەست نەچێت! بەڵکو بۆ کوڕەکەی خۆم بێت، نایەوێت لە ماڵەکەی بڕواتە دەرێ، هێندەی دڵ پێوەیەتی! کەئەمەش پێچەوانەیە لەگەڵ مانای ئایەتەکە.

## سیفەتی چوارەم: ﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَـٰفِظُونَ ۝﴾

قورئان دەفەرمووێت:ئەوانەش پارێزەری داوێنیانن، خۆیان لەهەموو ڕێگەیەکی یاساغو ناشەرعی دەپارێزنو، لەجێبەجێکردنی ئارەزووەکانیاندا خۆڕاگرن. ئەمەش هەمووی شەخسیەتی ئینسانە، داوێنیان لە داوێن پیسی، لە بەدڕەوشتی دەپارێزن، گەر سەیری وشەکانی قورئان بکەین: (حَـٰفِظُون) هەیە، نافەرمووێت: داوێن پیسیان دەستناکەوێت، چونکە زۆر کەس هەیە ڕەنگ بێ حەزی لەبەد ڕەوشتی بێت، بەلاّم دەستی ناکەوێت، بۆی ناڕەخسێت.

ئەم مەرد و پاڵەوانانەی قورئان کەباسیان دەکات، یەخەیان پێ دەگرێت، یوسف ئاسا دەڵێن: ئێمە نامانەوێت، ئافرەتێکە یەخەی گەنجێك دەگرێت، کچێکی گەنجە، کوڕێکی باش لە لەشو لاردا، بەلاّم لەناخدا وێران! یەخەی پێدەگرێت کەوا شەرەفی بشکێنێت، کەچی ئەم لەبەر خوا (حَـٰفِظُون) داوێنی خۆی دەپارێزێت، واتە: نەك کڕیاری داوێن پیسی نیە، بەڵکو ئەگەر یەخەشی بگرێت خۆی لێدەپارێزێت.

خوێندنەوەم بۆ ئەم ئایەتە کە قورئان دەفەرمووێت: (حَـفِظُون):

یەکەم: بۆ ئەو گەنجانەی کە خێزانیان نیە، ئەوەندە بەشەخسیەتن خوا مەدحیان دەکات لە قورئان کە داوێن پیسی نەك هەر ناکەن، ئەگەر یەخەشی پێگرتن خۆی لێدەپارێزن.

دووەم: ئەو ژنەکەی کە هاوسەری حەلاڵی خۆی هەیە، ئەو پیاوەی کە ژنی حەلاڵی خۆی هەیە، کە ئینسان هاوسەری هەبوو بەڕاستی ئەگەر مەردایەتی هەبێت دوورە لە داوێن پیسی. ئەم خێزانەی خۆی دەپارێزێت. لەبەر ئەوە دەڵێ دوورم ئەگەر هاوسەرم نەبێ لەوانەیە توش ببم، بۆیە کەموکوڕیەکانی یەکتر دەپۆشن، ژنەکە کەموکوڕی هەیە، پیاوەکە لەبەرخاتری خوا بۆی دەپۆشێت، بلاوی ناکاتەوە.. ژنەکەش بۆ پیاوەکە ئەمە (حَـفِظُون) ە.

هیچ هونەرێك نیە پیاوێك هەرچی عەیب بێت نەیبێت، ژنەکەی ڕێزی لێبگرێت، بەڕاستی مەردایەتی نیە ژنێك شاژن بێ و پیاوەکەی ڕێزی لێبگرێت، گرنگ ئەوەیە خوا دەفەرمووێت: تۆ بیپارێزیت، کە ئەو عەیبی هەبوو تۆ عەیبەکانی قبوڵ بکەیت.



## دوای ۱۱ساڵ مەردایەتیەکەی دەرکەوت !

پیاوێك ژن دێنێت، هاوسەری ژیانی هەڵدەبژێرێت، هەر دووکیان ڕێك و پێکو بە ئەخلاق. دوای چوار ساڵ، خوای گەورە منداڵیان پێ نابەخشێت، تا چوار ساڵ سەبر دەگرن.

دوای ئەو ماوەیە بە زەخت و زۆری ئەم و ئەو و سەرکۆنەی هەردوو بنەماڵە، ژن و پیاوەکە دەچن پشکنینێکی وردی خۆیان دەکەن لە ڕووی خوێن و هۆرمۆنات و جنس و سپێرمەکانەوە.. کابرای دکتۆر دەڵێت: کاکە بەیانی وەرنەوە. پیاوەکە دەڕوات پێش مەوعیدەکە سەری موختەبەرەکە دەدات، دەڵێت: کاکە چی بوو؟! دەڵێت وەڵاهی کاکە ئەبوایە ژنەکەشت لەگەڵدا بێت بۆ ئەوەی هەردووکتان دڵنیابن، تۆ وەکو پیاو هیچ عەیبت نیە لە بوونی منداڵدا، هەموو سپێرمەکان و تووەکانت تەواون، بەڵام بەداخەوە چونکە خێزانەکەت نەخۆشی گورچیلە و بۆریەکانی میزەڵدان و ئەمانەی هەیە، ڕێگرە لەبوونی منداڵداندا، ژنەکەت نەزۆکە و هەرگیز منداڵی نابێت!!

پیاوەکە زۆر مەردانە بە کابرای موختەبەر دەڵێت: دوای سەعاتێك مەوعیدمانە، خێزانەکەشم دێنم، بەس من یەك تکای برایانەم لە تۆ هەیە، هەتا ماوم مەمنونتم، لە لای خێزانەکەم بڵێ عەیب چیە لە تۆدا نیە، و عەیب لە پیاوەکەدایە و پیاوەکەت نەزۆکە و منداڵت نابێت!

دەچێتەوە بە دوی خێزانیداو لە مەوعیدی خۆیدا دەچنەوە و لەو کاتەدا تاقیگەکە پشکنینەکە دەردەکات، دەڵێت: خوشکم وەڵاهی تۆ هەرچی عەیب بێت نیتە، بەڵام ئەم پیاوەی تۆ نەزۆکەو منداڵی نابێت، کابراش دەڵێت: (إنا لله و إنا

إليه راجعون)، هەرچی خوای گەورە بیهێنێتە پێشەوە دیارە ئەوە ئافرەت لە بەرژەوەندیمان دایە و، من ڕازیم بە قەدەری خوای گەورە.

پێنج ساڵ دوای ئەوە، ئەم ئافرەتە خۆی دەگرێت، ئەوەندە گوشاری خەڵك لەسەری دروست دەبێت، خزم و کەس و کار و میوان و دۆست، ئاشکرا دەبێت کە دکتۆر وتوویەتی: ئەم پیاوە نەزۆکە و ئافرەتەکە هیچ عەیبێکی نیە، بەردەوامیش ئەم ئافرەتە مێشکی مێردەکەی دەکوڵێت، برۆ بۆلای دکتۆر، بچۆ بۆ دەرەوەی وڵات، هەوڵی خۆت بدە، دەڵێن چارەسەر ئێستا هەیە، بەڵام ئەم پیاوە بۆ کوێ بڕوات، ئەو دەزانێت کوێی دێشێت، ئەم عەیبی نیە، بڕوا بۆ کوێ؟! بەڵام هێشتا لەڕووی ژنەکەی نەداوە کە ئەم گرفتە لە تۆوەیە، کە تۆ ئەوەندە مێشکی منت کوڵیوە، پیاوی مەرد ئاوایە!

دوای نۆ ساڵ ژنەکە ڕۆژێك پێی دەڵێت: هەموو هیوا و ئاواتی ئافرەتێك ئەوەیە کە شوو دەکات، دوای هاوسەرێکی حەڵاڵ کۆرپەیەکی چاوگەش لە باوەشی خۆیدا ببینێت، من نۆ ساڵە ئاواتی ئەوەم ئەم مەمکانەم شیری تێ بێت و بیخەمە دەمی منداڵی جگەر گۆشی خۆمەوە، چاوم ڕۆشن بێت بەو منداڵەی کە لە قورئاندا دەفەرمووێت: ﴿قُرَّتُ عَيْنٍ لِي وَلَكَ﴾ منداڵ سۆمای چاوە، بیل بیلەی نوری ڕۆشنای دڵەکانە.. ئەی پیاوەکە ئەگەر دەزانیت تۆ هیچ منداڵت نابێ و تازە حەزت لە منداڵ نیە، یان وایان پێ وتووی کە بێ ئومێد بوویت، تکات لێدەکەم با مەحرووم نەبم لە منداڵ، وەرە دەستم لێبەردە و جیادەبینەوە و تەڵاقم بدە!

هێشتا ئەو پیاوە ناڵێت: هەی نامەرد، وەرە با کەمو کوڕیەکانت پێ بڵێم، ئەوە لە منەوە نیە، ئەوە لە تۆوەیە، ئەم پیاوە خۆی ڕادەگرێت..

پیاوەکە دەڵێت: ماوەی یەكساڵی دیکەش مۆڵەتم بدە.. دەڵێت با ساڵێکی تریش بچێتە سەر ژیانی هاوسەریمان، کە ئێمە بە بێ منداڵین.

لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا ئەم ئافرەتە کە دکتۆر شەش ساڵ لەوەو پێش پێی وت: نەخۆشی گورچیلەت هەیەو، بۆریەکانی میزەڵدانت ئیلتیهابی زۆریان هەیە.. -سبحان الله- هەردوو گورچیلەی ئەو ژنە لەکار دەکەون! سەرەڕای ئەوەیش بەردەوام چارەسەر بەکار دەهێنێتو، ئەم پیاوەشی کەمتەرخەم نەبوو لێی، بەردەوام پسپۆڕی گورچیلەی بۆ دەدۆزیەوە..

دواتر دکتۆرەکان پێی دەڵێن: دەبێت هەردوو گورچیلەکانی فڕێ بدرێت، بە مێردەکەی دەڵێن: لە نزیکترین کاتدا هەوڵبدە گورچیلەیەکی بۆ پەیدا بکەیت..

ئەم پیاوە پارەشی زۆرە، ئەشتوانێت گورچیلەیەکیش بکڕێت، دیسان مەردایەتیەکی دیکە دەکات، دەیەوێت گورچیلەیەکی خۆی بداتێ، پشکنینی بۆ دەکەن، ئەم گورچیلەی بۆ دەشێت. بەڵام هێشتا نایەوێت ژنەکەی منەت باری بێت، پێی دەڵێت: من گورچیلەکەت بۆ پەیدا دەکەم..

پێی دەڵێت: دەچینە دەرەوەی وڵات، ئێمە دەوڵەمەندینو لە دەرەوەی وڵات چارەسەری بەهێزتر هەیە، چاندنی گورچیلە و زەرعی گورچیلە بەهێزترە، منیش بۆ خۆم کۆمەڵێك نەخۆشی لە لاشەی خۆمدا شك دەبەم، هەم فەحسو پشکنینەکان بۆ خۆم دەکەم، هەم بەڵکو بۆ منداڵبوونەکەش چارەسەرێکی خۆم بکەم..

لەوێ پیاوێك دەدۆزێتەوەو بە پارەیەکی یەکجار زۆر گورچیلەیەکی لێدەکڕێت، بۆ ئەوەی خێزانی پێی نەزانێ.. بەڵام لە ژووری نەشتەرگەریدا بە دکتۆرەکان دەڵێت: من خۆم گورچیلەی خۆم دەبەخشم، ئەمیش لە ژوورێکی تر لەسەر

قەرەوێڵە دەکەوێت، ئەڵێن ئەو چی بوو، دەڵێن ئەویش لەوکاتەدا ڕیخۆڵە کوێرەی گرت و ورگیان هەڵدڕیوە.. نە ژنەکەی نەخزمەکانی نازانن کە ئەم گورچیلەی خۆی پێ بەخشیوە!

دواتر کە دێنەوە ماڵەوە، هەردووکیان لەدەرەوە دەگەڕێنەوە، دوای ئەوەی کە ئەم گورچیلەی پێ دەبەخشێت، ئەم ئینتیهابە لە میزەڵدان و گورچیلەکانیدا نامێنێت، -سبحان الله- ئەم ژنە حامیلە دەبێ و کوڕێکیان دەبێت، دوای نزیکی پانزە ساڵ خوای گەورە منداڵیان دەداتێ.

ڕۆژێك پیاوەکە بە کاری بازرگانی لەگەڵ هاوڕێیەکیدا دەڕۆنە دەرەوەی وڵات -ئەوەی ڕووداوەکە دەگێڕێتەوە هاوڕێکەیەتی-، ئەڵێ تەلەفونێکی بۆ کراو خێزانەکەی دەگریا، پیاوەکەش دانیشت و دەستی کرد بە گریان، ئەو لە تەلەفوندا و ئەمیش بە گریان و فرمێسك بە ڕیشا دەهاتە خوارەوە.. منیش نەمدەزانی مەسەلە چیە، بەڵام وتم دیارە ڕووداوێکی دڵتەزێنە، لەتاوی ئەو برا دڵسۆزەم دەگریام!

لەو کاتەدا کە تەلەفونەکە تەواو بوو، وتم چی بوو؟!

وتی: نهێنیەك هەبوو حەزم کرد لەدوای مردنم ئاشکرا ببێت، بەڵام بەداخەوە من دەفتەری بیرەوەری و ڕۆژانەم هەیە، کە ئەمڕۆ چی ڕوویداوە، دەفتەرەکەم لەماڵەوە لێ بەجێ ماوە، کە ڕۆیشتم خێزانەکەم خوێندویەتیەوە، ئێستا بۆی دەرکەوتوە ئەو ڕۆژە کە چووینە لای دکتۆر و، بەداخەوە دکتۆرەکە وتی خێزانەکەت نەزۆکەو تۆ عەیبت نیە، ئەو ڕۆژە بوو لە دەرەوەی وڵات گورچیلەیەکی خۆم بەخشی و خێزانەکەم پێی نەزانی، ئێستا خێزانەکەم کە خوێندویەتیەوە لەم ساتە وەختەدا وتوویەتی داوای لێبوردنت لێدەکەم، جارێ

پێش ئەوەی ڕووبەڕوت ببەمەوانیٚ و شەرمەزارم و عارەقی شەرمەزاری بڕێژم، تۆ پیاوێکی گەلێك مەرد بووی، لە ئێستاوە بمبەخشە!

دەڵێت: منیش وتم: وەلآهی نەمویست لە دنیادا ڕۆژێك چاو بەرەوژێرت بکەم، ڕۆژێك منەتت بەسەردا بکەم، ئەوە دونیا خوای گەورە هەر لە دنیادا قەرەبوی کردنەوە، دەڵێت بەختەوەرترین ژیانمان هەبوو، دوای ئەوە هەموو ناخۆشی و ناسۆریەکان، ژنەکەم هەمیشە سەری دادەخست لە ئاستمدا، بەڕاستی هەستی بە تەریقی دەکرد، بەلآم من ئەو باسەم دادەخست وە بەردەوام هەوڵم دەدا کە بیری نەیەتەوە.

## مانای سەرپەرشتی پیاوان (قوامە):

قورئان دەفەرمووێت: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ﴾، واتە: پیاوان سەرپەرشتیارن بەسەر هاوسەرەکانیانەوە، مافی بەڕێوەبەرێتیان بەسەر ژنانەوە هەیەو، دەتوانن چاودێریان بکەن. ئایەتەکە دەفەرموێت: (ٱلرِّجَال) بەلآم هەموو کەس باش لە قورئان تێناگات، نەیفەرموو: (**الذُّكُورُ قَوامونَ عَلى النِساء**)، نێرینەکان لەبەر ئەوەی ڕیش و سمێڵیان هەیە، کەڵەبابن بەسەر مێینەکانەوە کە ئافرەتانن، دەفەرمووێت: (ٱلرِّجَال) مەردەکان، پاڵەوانەکان، (**قَوّامە**)ی هەیە بەسەر ژنەوە.

بۆیە دەڵێین: (قەووامە) مانای ژن بەکۆیلەو بەبەندکردنی نیە بۆپیاوان وەك ئەوانە لێی تێگەیشتون، بەڵکو ئاراستەو ڕێنماییەکی خواییە بۆ شێوە کارو

ڕەفتاری پیاوان لەگەڵ ژناندا، (تەوجیه)ی خواییە بۆیان کەدەبێ زۆر بەچاوی ڕێزەوە ئەو سپاردەو ئەمانەتە خواییە، لەچاویان باشتر بپارێزن، مافیان دابین بکەن لە لە خانوو جلوبەرگو خواردن، پەروەردەو هۆشیارکردنەوەی لە گیرو گرفتو ژیانیان بۆ مسۆگەر بکەن. بۆیە لە کاتی بێ (نەفەقە)یدا دەسەڵات بەژن دراوە دەست لە پیاوەکەی هەڵبگرێت.. بۆیە بەکورتی: ئەو پلەو دەسەڵاتو پایە کە بەپیاوان دراوە، بەپرس بوونو ئەرك لەسەرشان نانە (**مسؤلية التكليف**)ـە، نەك بەزیاتر دانانی پیاوانە بەسەر ژناندا (**تفضيل**)و (**تەشريف**).

### خەڵاتی چوار سیفەتە قورئانیەکە:

قورئان بەم شێوەیە دەفەرموێت: هەر کەسێك ئەم چوار سیفەتەی تێدا بێت کەپێشتر باسکران، خوای گەورە خەلاتی دەکات، دەفەرموێت: ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْوَٰرِثُونَ ۝﴾ ئەوانە جێگایان بەهەشتە، ئەوانە میرات گری بەهەشتن، ﴿ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ۝﴾ ئەوانە دەبنە خاوەنی فیردەوس، کە خۆشترینو بالآترین شوێنی بەهەشتەو، بەمیرات ئەیبەن چونکە ڕەنجو ئازارێکی زۆریان بۆ کێشاوە، بۆیە جگە لەوان کەسێکی تر شیاوی ئەو شوێنە نیە، کە شوێنی پێغەمبەری خوایە ﷺ، خوا لەگەڵ پێغەمبەردا ئەم ڕەوشت بەرزانە کۆدەکاتەوە، (خَـٰلِدُون) بە هەتا هەتایش تێیدا دەمێننەوە..

بەڵێ ئەو سیفەتانە کەسایەتیو تایبەتمەندیەکانی مسوڵمانان دەست نیشان ئەکەن، نیشانەی کۆمەڵو کۆمەلگەی بڕواداران دیاری دەکەن. هەر بەو

سیفەتانەش لەبێ بڕوایان جیا ئەبنەوە، هێما بەکامڵ بوونی ئادەمیزو هەر بەوانەش دەبنە مرۆڤی ڕاستەقینە، نەك ئەوانەی کەوەك ئاژەڵ هەر ئەخۆنو ئەخەون، بێئەوەی هیچ تەکلیفو پێویستیەك جێبەجێ بکەن.

## سیفەتەکانی بەندە هەڵبژێراوەکان:

لەکۆتای ئایەتەکانی سورەتی (الفرقان)، بەندە تایبەتیەکانی خوا، وەلیەکانی خوای گەورە باس دەکات ﴿وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ ئەو بەندانەی کەخوا هەڵیبژاردوون:

### سیفەتی یەکەم: ﴿وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا﴾

بەندە ڕاستەکانی خوای بەبەزەیی ئەوانەن کەزۆر بەسەلاری‌و نەرمی‌و لەسەرخۆو بێدەعیەو فیز بەسەر زەویدا دەڕۆنە ڕێوە، بەهێمنی دەڕۆن سەیارەی پێبوو هەر هێمن و لەسەرخۆیە، بەپێ ڕۆشت هەر هێمن و لەسەر خۆیە، ئەو بەندە هەڵبژێردراوانە هێمن و سالار و سەنگینن لەڕۆشتندا، وەك لەفەرمودەیەکیشدا هاتوە پێغەمبەری خوایە ﷺ، دەفەرموێ: (**إذا آتيتم الصلاة فلا تأتوها وأنتم تسعون..**) هەرکات ویستتان وەرن بۆ نوێژ بە تاڵوکە پەلە مەیەن بەڵکو زۆر لەسەر خۆبن.

### سیفەتی دووەم: ﴿وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمٗا ۝﴾

ئەگەر کاتێکیش کەسە نەزانەکان لەڕوویان دەوەستن بە قسەی ناشیرین‌و نەفامانە، یان زمان شڕ، دەم پیس، قسەی پێ وت، ئازاری دا، ئەم بەرامبەری

ناوەستێتەوە، جوابی ووشەی ناشایستەی خەڵك ناداتەوە، شەڕە جنێو ناكات، لەبەر لاوازی نا، دەتوانێت تۆڵەی لێبكاتەوە بە گرتی بدات، بەڵام ئەم دەڵێت: من شەخسیەتم هەیە، بەقسەی چاكو بێوەیو ووشەی جوان وەڵامیان دەداتەوەو دەڵێت: بڕۆ خوات لەگەڵ بێت.

## سیفەتی سێیەم: ﴿وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَـٰمًا ﴿٦٤﴾﴾

ئەوانەن شەوگار بە شەونوێژ و سوژدەو بەپێوە وەستان دەبەنە سەر.. شەونوێژ زۆر گەورەیە، مەردی دەوێت، كەسێ سەعات دوونیوی شەو سێی شەو پێش بانگ هەستێت شەونوێژ بكات! بەڵام قورئان دەفەرموێت: پێش شەونوێژەكە ئەو كەسانەی بەندەی هەڵبژێردراوی خوان، كەسایەتیان بەهێزە، كەسایەتیان لە ڕۆیشتندا هێمنو لەسەر خۆن، بە سەیارە بێت یان بە پێ، دووەمیان: زمانیان سەلامەتە، شەڕە جنێو ناكەن.. ئەم دوو سیفەتە لە شەو نوێژ گەورەترە لای خوا!

هەندێ جار كەسێ شەونوێژ دەكات، ژنو منداڵی لەدەست جنێوەكانی هەراسانن، جاری واهەیە كەسێ زۆر جوان نوێژ دەكات كەچی نازانێت سەیارە بە هێمنی لێبخورێت، خەڵكی گەڕەكێك هەراسان دەكات. قورئان دەفەرموێت: پێش شەونوێژ كەسایەتی! ئەو كەسەی ئیمانداری بەحەق بێت، ئەو كەسەی بیەوێت خۆشەویستی خوا بێت، دەبێت خاوەنی شەخسیەتو ئەخلاق بێت، ئەمجا عیبادەتی خوای لێ قبوڵە.

## تێکشکێنەرەکانی کەسایەتی لەقورئاندا:

قورئان هەندێ ڕەوشتی دیاری کردوە دەبێ ئینسانی مسوڵمان لێی دوور بێتو خۆی بپارێزێت لێیان، چونکە سەرەتای ئایەتەکە بە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ دەست پێ دەکات، ئەمەش ڕاستەوخۆ ئاماژەیە بۆ مسوڵمانان ئەم کارانە نەکەن، لەبەر ئەوەی هۆکاری سەرەکی تێکشکێنەری کەسایەتی ئینسانە. لە ئایەتی (١١-١٢)ـی سورەتی (الحجرات) ئاماژە بۆ ئەو ڕەوشتانە کراوە:

**یەکەم: ﴿لَا يَسۡخَرۡ﴾**

قەت گاڵتە و گەپ بە خەڵك مەکە، بە خەڵك ڕامەبوێرە، با هیچ کۆمەڵێ گاڵتەبە کۆمەڵێکی دیکە نەکات، لەوانەیە گاڵتەپێکراوەکان (لای خوا) لە گاڵتەچیەکان چاکتربن، چونکە ترازووی چاکیو خراپی تەنها لای خوایە.

**دووەم: ﴿وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ﴾**

وەتانەو تەشەر لەیەکتر مەدەنو یەکتر عەیبدار مەکەن، بۆیە ووشەی(أنفسکم)ی بەکار هێناوە، چونکە تانەو توانج گرتن لەمسوڵمانان وەکو توانجت لە خۆت گرتبێت وایە، لەبەر ئەوە مسوڵمانان وەك لاشە وان.

**سێیەم: ﴿وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلۡأَلۡقَٰبِ﴾**

ناوو ناتۆرەو نیتکە لەیەکتر مەنێن، بەناوو ناتۆرە یەکتری بانگ مەکەنو بە دووی خەڵك مەخەن، بەناڕەحەتی خەڵك خۆت خۆشحاڵ مەکە.

**چوارەم:** ﴿ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ﴾

خۆتان لەزۆرێك لەگومان بردن بەیەكتر بەدوور بگرن، چونكە هەندێ لەو گومانانە مایەی گوناهو دووچاربوونتانە لای خوا. لەفەرمودەیەكدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (**إیاكم والظن فإن الظن أكذب الحدیث..** ) واتە: وشیاربن لەگومان بردن چونكە گومان لەهەر قسەیەك درۆترە.. كام گومانەی زۆر ڕاستە پلەی نزمترە لەدرۆ!

**پێنجەم:** ﴿وَلَا تَجَسَّسُواْ﴾

بەدوای عەیبو عارو كەمو كوڕی یەكتردا مەگەڕێنو چاوەچاوە مەكەن، بەدوای نهێنیو ژیانی تایبەتی خەڵكدا مەگەڕێن، مەڵێ ئەوە دراوسێكەم چی كرد؟! ئەوە چی خوارد؟! ئەوە ..؟!

**شەشەم:** ﴿وَلَا يَغۡتَب﴾

لەپاش ملە ناوی یەكتر بەخراپە مەبەن غەیبەتی خەڵكی مەكەن. لەدرێژەی ئایەتەكەدا دەفەرموێ: ئایا كەستان پێی خۆشە گۆشتی برای خۆی بەمردووی بخوات؟! ئاشكرایە ئەوەتان زۆر پێناخۆشەو نایخۆن، دیارە ئەمە ئەو پەڕی ناشیرین كردنی ئەو كارەیە، تا مرۆڤەكان نەیكەن.

بەپێغەمبەری خوایان ووت غەیبەت چیە؟ ئەویش فەرمووی: (**ذكرك أخاك بما یكره**) ناوهێنانی براكەت بەهەر شێوەیەك پێی ناخۆش بێت.. كابرا وتی: باشە ئەگەرئەوەی من پێی ئەڵێم وابووهەر بەغەیبەت دادەنرێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (**إن كان فیە ماتقول فقد إغتبتە، وإن لم یكن فیە ماتقول فقد**

بهتە). واتە: بەڵێ ئەگەر ئەوەی تۆ ئەیڵێی وابوو ئەوە غەیبەتت کردوە، ئەگەر نا ئەوە بوختانت بۆکردوە.

## دوو نمونە لەسەر بوختانو گومان:

### بوختان کردن بۆ حەزرەتی عائیشە:

ئەگەر کەسێك بە ناحەق شەخسیەتی شکێندراو، ئازار درا، لە کەسایەتی هێندرایە خوارەوە، دەبێ ئارامگربێتو ڕوی لە خوا بێت.. دایکی ئیمانداران حەزرەتی عائیشە ڕەزا و ڕەحمەتی خوای لێبێت، خێزانی پێغەمبەر ﷺ، بوختانی بۆ کرا. بانگ درا بەشاری مەدینەدا مونافیقەکان سەریان بەیەکەوە دەنا بۆ ئەم باسە، هەموو شاری مەدینە ئەوەی تێدا بلاّو بوویەوە: حەزرەتی عائیشە زینای کردووە! خێزانی ئەشرەفی مەخلوقات بوو!

هیچ شتێك لە دنیادا لەوە ناخۆشتر نیە ئینسان ببیستێتەوە بڵێن خێزانەکەت داوێن پیسی کردووە! لەگەڵ کێدا؟! لەگەڵ خزمێکی خۆتدا، لەگەڵ کابرایەکدا کە دۆستی گیانی بەگیانی پێغەمبەربووە ﷺ، پیاوێکی هەتا بڵێی بە ئەخلاق و بەڕەوشت..

سەرەتای ڕووداوەکە بەو جۆرەبوو: لە سەفەرێکدا حەزرەتی عائیشە لەکاروانی مسوڵمانان دواکەوتبوو بەتەنیا مابویەوە چاوەڕێی کردبوو بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە هەڵیگرن لەگەڵ خۆیان بەڵام کەس نەگەڕابوەوە، تا هاوەڵێك بەناوی (سەفوان) بەلامدا تێپەڕیو وشترەکەی لێم نزیك کردەوەو وتی: سەرکەوەو گەیاندمیە کاروانەکەو هەر ئەوەندە.. وەکو ئافرەتێك لەو سەرجادە سایەقێك پیاوەتی بکاو

سەیارەکەی بۆ ڕاگرێتو بیگەیەنێت، پیاوێکی نامەرد بیبینێت بڵێ ئەو ژنو پیاوە زینایان بەیەکەوە کرد..

مونافیقنی شاری مەدینە ئەم دەنگو باسەیان بڵاوکردەوە، پێغەمبەر ﷺ هێشتا لە ڕووی حەزرەتی عائیشەی نەدا، دوای یەك مانگ وەحی ئاسمانیش ڕاوەستا، هیچ لەو بارەوە ناڵێت..

پێغەمبەر ﷺ هێندە دڵتەنگ بوو عائشە دەفەرمووێت: هەستم دەکرد ئەو موحیبەتەی جارانی تۆزێك کەمبووەتەوە، ئەو هەواڵ پرسی و قسە خۆش و ڕووە زەردەخەنەی کەمبوەتەوەو نەشمدەزانی بۆ وایە! هەتا لە پورێکم بیست کە وتی، عائیشە ئاگات لە چیە؟ شاری مەدینە هەموو شڵەقاوە، تۆ بوختانت بۆ کراوە، کە تۆ زینات کردووە پەنا بەخوا!

دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ هات بۆلام، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا شتێکی وام بیستووە، فەرمووی بڵاوبۆتەوە ئەم دەنگ و باسە، بەلام ئەگەر کاری وات کردوە داوای لێبوردن لەو خوای گەورە بکە، ئەگەر کاری واش ڕووینەداوە عائیشە تۆ لەوانە نیت کە کاری وات لێبوەشێتەوە، بڵێ نەمکردووە..

حەزرەتی عائیشە دەفەرمووێت: ئەوەندە تێکچووبووم هیچم نەوت، وتم: هیچ ناڵێم وەکو باوکی یوسف دەفەرمووێت: ﴿وَٱللَّهُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ﴾ – سبحان الله– لە پەرێشان حاڵی ناوی یەعقوبم لەبیر چووبوویەوە. وتم ئەوەندە دەڵێم خوایە پشت و پەنام بەس تۆی.

دەفەرمووێت: وەلاهی چاوەڕێ بووم خوای گەورە بە خەونێك بە پێغەمبەر ﷺ، بگەیەنێت جوبریل لە ڕێگایەکەوە موژدەی بداتێ، قەت ئەوەندەم نەدەزانی

خوا له قورئاندا ناوی من تۆمار بکات، دەفەرمووێت ڕاکشام و دەستم کرد بە گریانێك بە هیچ ژێر نەدەبوومەوە، دایك و باوکیشم نەیاندەزانی چی بڵێن؟!

دەفەرمووێت: لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ هەموو لەشی عارەقی دەردا، لەرزێك دەیگرت، کەوا وەحی دەهات، باوکم زۆر ترسا، فەرمووی خوایە ڕەحممان پێ بکەیت، بێ بەری بوونی عائیشە دەربڕیت، خوایە خەجاڵەتی بەردەمی خواو پێغەمبەرم نەکەیت، بە بۆنەی کچەکەمەوە..

دەفەرمووێت پێغەمبەر ﷺ ڕووی گەشایەوە، فەرمووی: سورەتی (النور) سورەتی ڕووناکی، هاتە خوارەوە ئەی عایشە.. پانزە ئایەتی قورئان باسی داوێن پاکی حەزرەتی عائیشەی کرد، مونافیقو بوختان چیەکانی سەر شۆڕ و ڕیسوا کرد..

## ئای لەرۆژی ملوانکەکە!

لە صەحیحی بوخاریدا ئەم بەسەرهاتە شیرینە هاتووە کە دایکمان حەزرەتی عائیشە بۆمان دەگێڕێتەوە، دەفەرمووێت: ژنێکی فەقیرحاڵ چووبوە تەمەنەوە، بێ کەس، کەس نەیدەزانی کەسی هەیە، نیە، کاتی خۆی لە بێ دەرەتانی باوك و دایکی نەمابوو، توشی خزمەتکاری بوو بوو، لە کچۆڵەییەوە کەوتبوە ولاتی غەریبی، دواتر هاتبوو لە مەدینە مسوڵمان بوو بوو..

دەفەرمووێت: لەناو مزگەوتەکەی پێغەمبەردا ﷺ، خێمەیەکی بچکۆلەی بۆخۆی هەڵدابوو لە گۆشەیەکی مزگەوتدا، لەو ژوورەدا دەژیا، لەو خێمە بچکۆلەدا، خاتوو عائیشە دەفەرمووێت: زۆر یارمەتی منی دەدا، چونکە بێ کەس

بوو، کەسی نەبوو، دایمە سەری بە ماڵی پێغەمبەردا ﷺ دەکرد، دەهات یارمەتی ئیش و کاریشی لەگەڵ دەکردم، بەڵام هەموو کاتێك شتێکی دەگوت: دەیگوت ئای لەو ڕۆژەی کەوا ملوانکەکە دۆزرایەوە، ئای لە ڕۆژی ملوانکەکە!

وتم: (یوم الوشاح) ڕۆژی ئەو گەردانەیە، ئەو ملوانکەیە چیە ئەوەندە دەڵێیەوە؟ بۆم باس بکە؟!

وتی: کاتێك کە لە دایك و باوکم دابڕام و بێ کەس و بێ کار، بوومە خزمەتکاری ماڵان‌و هەر ڕۆژێك لە ماڵێك بووم.. خزمەتکاری ماڵی گەورەیەکم دەکرد، ئافرەتێکی گەنج بووم لەو کاتەدا، منداڵێکیان هەبوو تاقانە بوو، زۆر خۆشەویست بوو، لە پێستی حەیوان کە خۆشە(دەباخ) کرابوو، شتێکیان بۆ بڕی بوو، بە زەنگیانە و ئاڵتون ڕازاندبوویانەوە، لە ملی منداڵەکەیان دەکرد. من ڕۆژانە ئاگام لەمنداڵەکە دەبوو، کاتێکم زانی منداڵەکە لە ملوانکەکەی پچڕی‌و فڕێیدا.. وەك چۆن منداڵ پەلاماری شت دەدات..

لەوکاتەدا –سبحان الله– قەلەڕەشێك هات دەنوکی پێدا کردو وای زانی گۆشتە و بردی.. هەرچی هاوارم کرد بەری نەدا!

هاتن وتیان: ملوانکەکە کوا چی لێهات؟!

وتم: باوەڕ بکەن نازانم و ئەو باڵندەیە هات بردی، هەرچی کردم نەیان بیست.. ڕوتیان کردمەوە، تەنانەت عەیب نەبێت ناو لەشیان پشکنیم، وەڵاهی زۆر بێ دەسەڵات بووم، زۆریان ئازاردام، هیچ دەسەڵاتێکم نەما، هەرچەند من مسوڵمانیش نەبووم ئەو کاتە، کافریش بووم، بەڵام دەمزانی (الله) هەیە، بە سروشتی بەشەری هیچ هانایەکم نەما هانای بۆ بەرم، دەیان کوشتم بە لێدان.

وتم: خوای گەورە فریام بکەویت، خوایە من دزیم نەکردووە، خوای گەورە ئەم سرە هەڵبماڵی، دەڵێت: لەو کاتەدا ئەو باڵندەیە هات لە ئاسمانەوەو، خولی خوارد هەتا لەسەری ئێمە گەردانەکەی فڕێ دایە خوارەوە!!

دەفەرموویت: هەموو ڕۆژێك ئەوەم بە بیر دێتەوە، دوای ئەوە ئەوەبوو کاری تێکردم، خوایەك هەیە لە ئەرز و ئاسماندا وایکرد کە ئەو باڵندە بێ زمانە بگەڕێتەوە، دەڵێت کە ئەوەیان بینی ئازادیان کردم، وتیان: بڕۆ گەردنت ئازاد بێت، لە عەبدایەتی ئازاد بە، هاتمە شاری مەدینە و پێغەمبەری خوام دۆزیەوە و مسوڵمان بووم.

جا دەڵێت: هەموو کاتێك ئەوەم لەبیرە چۆن خوای گەورە شەخسیەتی پاراستم لە کاتێکدا بە دزیان دەردەکردم، لە کاتێکدا بوختانیان بۆ دەکردم.

## بە ستەمکردن شەخسیەتت لەناو دەچێت

بەردەوام ئەگەر دەتەوێت خوا شەخسیەتت بپارێزێت هیچکات ستەم لەکەس مەکە، چونکە دوعای ستەم لێکراوت لێ گیرا ئەبێت، ئەی ئەو کەسەی دەسەلاتت هەیە: هەیە دەسەلاتی بە پارەو دەوڵەمەندیە، هەیە دەسەلاتی بە پلەو پایەو کارمەندێکە، کەسێ دەچێتە بەردەمی داواکاریەك پرسیارێ دەکات وا لێی تورە دەبێ‌و، دەیشکێنێ، وا دەکات کە لە ناخەوە دوعای لێبکات بڵێت: خوا ئەو پلە و پایەت لێ بستێنێتەوە..

وا مەبە، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت: **(إِتَّقِ دَعْوَةَ المَظْلُومْ)** خۆت بپارێزە لە دوعای ستەم لێکراو کە ستەمی لێ دەکەیت، **(وَ إِنْ كانَ كافراً)** با ئەو

ستەم لێکراوە کافریش بێت، هەتا ئەگەر سوجدەی بۆ خوا نەبردبێت، دارو بەردی پەرست بێت، لە جیاتی خوا، زوڵمی لێمەکە (**فإِنَّهُ لَيْسَ دونَها حِيجابٌ**) ئەو کافرەکە زوڵمی لێدەکەیت، ئەو کافرە و تۆ مسوڵمانیت زوڵمی لێبکەیت، دوعات لێبکات، پەردەیەك نیە لەنێوان ئەو و خوادا، خوا یەکسەر دوعاکەی لێوەردەگرێت! ئەی ئەگەر ئەوەی زوڵمت لێکردووە مسوڵمان بێت؟! ئەگەر هاودینو هاوقیبلەت بێ.

(شێخ محمد عبدالعاطي البحيرى) لەکتێبی (الوصايا المنبرية)، بەسەرهاتێك دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: ئەم ڕووداوەم بە چاوی خۆم بینیوە: دوو پیاو برادەری یەك دەبن، زۆر سیقەو متمانە لەبەینیاندا دەبێت، برادەی یەکەمیان لەو دەوڵەمەندترەو خاوەنی کۆمپانیاو شەریکەو پارەیەکی یەکجار زۆر دەبێت.. ڕۆژێکیان بەم برا دڵسۆزو گیانی بە گیانیەی خۆی دەڵێت: براکەم، شەریکەکەم پێویستی بە بڕێك پارەیە، مەشروعێکی تازەم وەرگرتووە هەتا سلفەم بۆ سەرف دەکرێت بەڵکو بڕێك پارە یارمەتیم بدەیت..

ئەویش دەڵێت: بەسەرچاو، چەندت پێویستە؟!

دەڵێت: چەندت بە دەستەوەیە؟ دەڵێت: دوو سەد هەزار ڕیاڵم هەیە لەماڵی دنیا، بەسەرچاو بۆت دێنم.. دەستبەجێ دەچێت لە ماڵەوە بۆی دێنێتو پارەکەی تەسلیمی دەکات. پاشی نزیکی دوومانگی پێدەچێت، چوار مانگی پێدەچێت پرۆژەکەی پێش دەکەوێت نزیکی تەواو بوون دەبێت، کابرا هەر چاوەڕێیە پارەکەی بداتەوە، دەزانێت پارە وەرگیراوە، سلفە هەمووی دراوە..

ڕۆژێکیان دەڵێت: براکەم ئەزانم جەنابت لەبیرت نەچۆتەوە، بەڵام باوەڕبکە منیش پێویستیم بەو پارە هەیە، بەڵکو پارەکەم بدەیتەوە ئەگەر بەدەستەوە هەیە، پرۆژەکەت تەواو بووەو گەشتۆتە شوێنی خۆی..

دەڵێت: پارەی چی؟! دەڵێت: ناکا لەبیرت چووبێتەوە، من هەموو سەرمایەکەم دوو سەد هەزار ریاڵ بوو، هەمویم نەدا بە تۆ؟!

دەڵێت: نەخێر، نەتداومەتیّ!

دەڵێت: ئاخر نابێت، باوەڕناکەم پارەیەکی وا گەورە لەبیرت چووبێتەوە، هەرچی دەکات کابرا خۆی بێئاگا دەکات.. دواتر زۆر بیّ منەتی دەکات، دەڵێت کاکە گیان سەرم مەئێشێنە، ئەوپەڕی دەتوانی بچیت لە دادگادا شکاتم لێبکەیت، کوا نوسراوێکمان لەنێواندا هەیە؟! کوا شاهیدێکمان هەیە؟!

دەڵێت: بەڕێز منیش ئەوەم دەزانی، بەڵام نێوانی من و تۆ ئەوەندە خۆش بوو لەڕووم نەهات داوای شاهیدونوسراوت لێبکەم.. کە ئەمە هەڵەیە، خوا لە قورئاندا دەفەرموێت: (قەرزت دا بەهەرکەسێك مەهێڵە بڕوات تا دوو شاهید ئاگای لێنەبێت، یان نوسراوێکی دەست خەت لە نێوانتاندا نەبێت).

دەڵێت: هەرچی ناونیشان، ڕۆژی بەسەرهات، قسەکانمانم بیرخستەوە، وتی: نابیستم، برۆ سکاڵام لەسەر بکە..

وتم: من شکاتەکە لە دادگای سەرزەویدا ناکەم، چونکە دادگای سەرزەوی بەڵگە تەماشا دەکات، من بەڵگەیەکم نیە بەسەرتەوە کە من داوای حەقی خۆم لە تۆ بکەمەوە، بەڵام هەر سوریت لەسەر ئەوەی هیچت لای من نیە؟!

وتی: سورم لەسەر ئەوەی هیچی تۆ لای من نیە!

دەڵێت: کابرای زوڵم لێکراو لەو کاتەدا دەستی بەرز کردەوەو، وتی: خوایە گیان دادگای سەر ئەم زەویە ناتوانێت عەدالەتی خۆی بچەسپێنێت، چونکە بەڵگەی دەوێتو بەڵگەم نیە، بەڵام ئەی (رب العالمین) لە دادگای تۆدا عەریزەی خۆم تۆمار دەکەم، لە دنیادا بە چاوی خۆم حەقی خۆم ببینم کە لەم کابرایەی بکەیتەوە..

دەفەرمووێت: ئەو بینایەی دروستی کردبوو، چەند قات بوو، بە شێوەیەکی ئەندازیاری دروستی کردبوو، هەرچی عەیب بێت نەیبوو، دارِماو پێنج سەد هەزار ریاڵی زەرەر کرد!

دەڵێت: ژنەکەی پێی وت ڕاکە ئەوەی هەمانە تیادەچێ پیاوەکە فریا بکەوە، دەزانی ئەو پیاوە چ دوعایەکی لێکردین لە لای خوا، سکاڵای خۆی تۆمار کرد..

وتی: ئافرەت ئەوە نیە سەدان بینا لە دنیادا ڕووخاوە..

دەڵێت: هەر نەی سەلماند، یەك حەفتەی پێچوو سێ کوڕی چووبوون بۆ سەیران، ئێوارەیەك گەڕانەوە خۆیان کرد بە ژێر گەلاَبەیەکدا هەر سێ جەنازەی سێ کوڕەکەی بەیەك دەقە بۆ هاتەوە بۆ ماڵەوە!

دەڵێت: ئەمجارە کابرا لەرزی، وتی: ئەوە تیری کابرا بوو لێی دام، دوعای مەزڵوم بوو.. چووبۆ لای کابرا بەسەر قاچەکانیدا کەوت، وتی: ئامان سەروەتم نەماوە، سێ کوڕم لە دەست داوە، یەك منداڵی حەوت ساڵانەی بچکۆلانەم ماوە لەگەڵ ژنەکەمدا، تو ئەو خوایە گەردنم ئازاد بکەو عەریزەکەت لە بارەگای خوا وەربگرەوە، هەوڵدەدەم قەرەبووی بکەمەوە بە قەرز و قۆڵە بێت، دوو سەد هەزار ریاڵەکەت بدەمەوە..

دەڵێت: کابرا وتی قەیناکە، مادام سەلماندت کە دادگایەك هەیە برۆ گەردنت ئازاد بێت..

لەبەر ئەوە دەبێ بەردەوام هەوڵبدەین حەقی خەڵکمان لەسەر نەبێت، چونکە دادگای سەر زەوی بەڕاستی هەموو شتێکی پێ یەکلای نابێتەوە، بەڵام دادگای (رب العالمين) هەیە، کە هیچی لێ بزر نابێت..





# بەشی هەشتەم

## بە دەست بڵاوی و قیست کردن، کەسایەتی خۆت لەناو مەبە

## خاڵە بنەڕەتیەکانی ئەم بەشە:

❁ **قالَ اللهُ تعالى:** ﴿كُتِبَ عَلَيۡكُمۡ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ إِن تَرَكَ خَيۡرًا ٱلۡوَصِيَّةُ لِلۡوَٰلِدَيۡنِ وَٱلۡأَقۡرَبِينَ بِٱلۡمَعۡرُوفِۖ حَقًّا عَلَى ٱلۡمُتَّقِينَ ۝﴾ **البقرة: ١٨٠**. (إن تَرَكَ خَيۡرًا، **اي: مالاً**).

❁ **قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (لا تَخيفُوا أَنْفُسَكُمْ بَعْدَ أَمْنِها، قالُوا: وَما ذاكَ يا رَسُولَ اللهِ ﷺ؟! قالَ: الدَّينُ). صَحيحٌ، رَواهُ أَحْمَد، (صَحيح الترغيب، رقم: ١٧٩٧).**

❁ **عَنْ سَلَمَةَ بنِ الأَكْوَعِ، كُنّا جُلوساً عِنْدَ النَبِيِّ ﷺ إِذْ أَتى بِجَنازَةٍ، فَقالُوا: يا رَسُولَ اللهِ، صَلِّ عَلَيْها، قالَ: هَلْ تَرَكَ شَيْئاً؟ قالُوا: لا، قالَ: فَهَلْ عَلَيْهِ دَيْنٌ؟ قالُوا: ثَلاثَةُ دَنانير، قالَ: صَلُّوا عَلى صاحِبِكُمْ) رَواهُ البُخاريُّ.**

❁ **قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (لَيُّ الواجِدِ يَحِلُّ عِرْضَهُ وَ عُقُوبَتَهُ). حَديثٌ حَسَنٌ، رَواهُ أَبوداود، وَالنَّسائي، وَ أَحْمَد، وَ حَسَّنَهُ الأَلْباني فِي صَحيحِ الجامع: (٥٤٨٧).**

## سەرچاوەکان:


١) چوار نامیلەکەی (د. علی شەریعەتی) وەرگێڕانی، هەژار، ل٥.

٢) گۆڤاری: (ڤینی بونیاد) ژمارە: ١، ل١١، ل١، ل٧، ل٤٢.

٣) المجموعة الثالِثَة مِن الوصايا المِنْبَرِيَّة، محمد عبدالعاطي بحيري، ج١، ص٢٠٥.

٤) صَفَحاتٌ مُشْرِقَة مِنْ حَياة السّابِقِينَ، نزير محمد مكتبي، ص١٨١.

٥) وَفيات الأعيان، إبنُ خَلَكان، ج٢ ص٢٧١.

٦) گۆڤاری (چرای ڕووناکی)، ژمارە: ٣٢، ل٣٢.

٧) گۆڤاری (ڕێگای ڕاست) ژمارە: ١٦، ل١٢٧.




## بەستنەوەی کەسایەتی بە پارەو ماددەوە:

یەکێك لەو شتانەی کە لە دێر زەمانەوە، هەر لەزۆر کۆنەوە بۆتە مایەی دروست بوونی شەخسیەتو کەسایەتی بۆ مرۆڤ لەبەر چاوی خەڵك، وە ئەگەر نەت بیّو لێی بیّ بەش بیو هیچت نەبێت، بەتایبەت ئەوە زۆر لەسەر ئاستی کەسایەتیو شەخسیەتی ئینسان دەکەویّ لەبەرچاوی کۆمەڵگا، لەسەر ئاستی تاكو خێزان و بنەماڵەو، هۆز و عەشیرەت، لەسەر ئاستی حیزب و حکومەت، ئەویش بوونی: (سەروەت و سامانە) بوونی پارە و پوڵە، بوونی دینار و دۆلارە، کە ئەو کەسانەی زۆریان هەیە هەر لە دێر زەمانەوە بە شەخسیەتدار دەناسرێن.

مامۆستا هەژاری موکریانی -ڕەحمەتی خوای لێبێت- لە یەکێك لە کتێبەکانیدا کە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، دکتۆر عەلی شەریعەتی بە فارسی نوسیویّتی، بە چەند ووشەیەکی کورت و پوخت ئەو مەبەستە دەردەبڕێتو دەفەرمووێت:

{پیاوی هەژار، پیاوی بیّ هێز، با چاکیش بێت، با پاکیش بێت، بەرچاو نیە، نەدار سووکە لەبەر چاوان، ناخرێتە ناو ڕیزی پیاوان، هەر کەس فەقیر بیّ پیاو نیە، بەلاّم هەرکیّ خاوەن زێڕە، بەلاّم هەرکیّ خاوەن زێڕە، خاوەن زۆرە، ئەگەر پیسە، ئەگەر ڕەشە، ئەگەر بۆرە، لەبەر چاوان زل و زۆرە، دەراوی دەمی ناخۆش بێت، دەم پیس بێت جنێو فرۆش بێت، دەڵێن پیاوێکی زۆرزانە، لە فز خۆش گفت ڕەوانە، قسەی جوانە، کاری جوانە، شارەزای شارەزایانە، هەژار زاناش بێت نەزانە، هەژار زاناش بێت نەزانە، دارا شورەیشی جوانە}.

ئەم وتانە بەتەواوی وایە، ئێمە قبوڵمان بێت یان نا، ئەوە واقیعێکە لەبەر چاوی زۆربەی خەڵکی، کەسی زۆر هەژار هەیە تەنها عەیبەکەی فەقیرییە، کەئەمە لای خەڵکی بۆتە عەیبە ئەگینا هیچ کەمو کورتیەکی دیکەی نیە، زۆر دەوڵەمەندیش هەیە هیچ شەخسیەتیەکی نیە تەنها پارەکەی نەبێت، ئەو قسانەی کە ئەو لە مەجلیسدا دەیکات، ئەگەر فەقیر بیکات خەڵك دەری دەکاتە دەرەوە، بەڵام قسەکانی قبوڵن تەنها لەبەرئەوەی دەوڵەمەندە.

لە ئیسلامدا ماڵ و سامان قەدەغە کراو نیە، دینی ئیسلامی ئێمە پێت ناڵێت هەموو تەمەنت بە هەژاری بەسەر بەری، بەڵکو نەکرێ بەئامانجی سەرەکی ژیانت، لە قورئاندا ماڵ و سامان بە خەیر ناو براوە (إِن تَرَكَ خَيْرًا) (أي إن ترَكَ مالاً) خوای گەورە وشەی ماڵی بەخێر و بەرەکەت ناوبردووە، بە دوومەرج:

یەکەم: حەلاڵ بێت، مافی کەسی بەسەرەوە نەبێت، هی خوشك و دایك و پورو ئەمانە نەبێت لەمیراتدا بۆت مابێتەوە، هەمویت خواردبێ، هی ڕەنجی شان و موشەقەتی خۆت بێت، بە ئیرادەی خوای پەروەردگار و بە ویستی خوا هەوڵت دابێ و خوا پێی بەخشیبی.

دووەم: بتوانیت لە قیامەتدا کە خوا پرسیای لێ کردی وەڵام بدەیتەوە، چونکە لەسەر هەموو شتێك یەك پرسیار هەیە، لەسەر ماڵ دوو پرسیار هەیە:

(مِن أَيْنَ اكْتَسَبَهُ، وَ فيما أنفَقَهُ) ئەی مرۆڤ، ئەی بەندەی خۆم، خوا لێت دەپرسێت: ئەم ماڵ و سەروەت و سامانەت چۆن پەیدا کرد، وە چۆنیش سەرفت کرد، دەبێت هەردووکی ئامادەبێت، ئاوام پەیدا کرد، ئاواشم سەرف کرد، ئەگەر بۆ ئەو ڕۆژە وەڵامێکی ڕووسورانەت پێ بێ و شەرمەزاری بەر بارەگای خوا

نەبیت. دەوڵەمەندی شتێکی باشە، چونکە هەم خۆت ئاسوودە دەبیت، هەم دەتوانی ئاسوودەیی بخەیتە ناو دڵ و دەرونی دەیان هەژار و نەداریشەوە، بەڵام ئەگەر هەژار بیت هیچت پێ ناکرێت، ئەوەی بە دەوڵەمەندێکی دەست و دڵ واڵا و بەخشندە دەکرێ، بەداخەوە هەژارێك ناتوانێت ئەو کارە بکات، وەك دکتۆر عەلی شەریعەتی نوسەرو بیریار دەڵێت:

(پێم خۆشە بەپێ خاوسیو بەدەم پیاسە کردنەوە بیر لەخودا بکەمەوە، نەوەك لەمزگەوتدا بمو بیرم لای پێڵاوەکانم بێت).

واتە: پێم خۆشە لە بازاڕدا خەریکی کار و کەسابەت و معامەلە و کڕین و فرۆشتنبم، پێڵاوەکانم لەپێمدا بێت، بەڵام دڵم لای خوا بێت، بەڵام حەز ناکەم ئەوەندە هەژاربم، لە مزگەوتدابم، نێوچەوانم لە سوجدەدا بێت، کەچی دڵم لە جیاتی لای خوا بێت، لای پێڵاوەکانم بێت، چونکە ئەگەر پێڵاوەکانم بدزن، جوتێك پێڵاوی ترم پێنەکڕدرێت، ئەمەیانم حەز پێ نیە..

ئەم وتەیە زۆر ڕاستە لە مزگەوتیشدا کاتێك خۆشە کە دڵت لای خوا بێت، ئەوەندە هەژار نەبیت لە سوجدەشدا خوات لەبیر نەبێت لێرەدا ئێمە کەباسی شەخسیەت دەکەین ئەوەندەی مرۆڤ بەلامانەوە گرنگە پارە هیچ بەهایەکی نیە بەبەراوردی مرۆڤ..

## هۆکاری پێشکەوتووی‌و هەژاری، کەسەکانن نەك وڵاتەکە:

شارەزایان دەڵێن: لە بواری پێشکەوتنی وڵاتدا لایەنی ماددی چەند گرنگە، لە بونیات نانەوەی ئەو وڵاتەدا، خودی مرۆڤەکان گرنگترن، شارەزایانی بواری

گەشەپێدانی مرۆیی دەڵێن: سەرچاوەی مرۆیی و هێزی مرۆیی و ماددەی ناو خاك، لە وڵاتێکدا دەبنە هۆی لە سەدا بیستی پێشکەوتنی ئەو وڵاتە، لە سەدا هەشتای ئەو مرۆڤانەی لەسەر ئەو خاکە دەژین وڵاتەکە پێشدەخەن. ئیستا دونیای ئەمڕۆ دابەش بووە بەسەر دوو چیندا، دابەش بووە بەسەر دوو بەرەی وڵاتاندا، بەرەی پێشکەوتوو، دەوڵەمەند، لەگەڵ بەرەی هەژار و دواکەوتوو. بەسەرنجدانی ئەم وتە دو ووشە پەیوەستن پێکەوە بۆ دەوڵەمەند دەڵێت پێشکەوتووە، کە وتی وڵاتێکی هەژارە دەڵێت دواکەوتووە! ئەم دوو زاراوانە بەرامبەر یەکن، **بەڵام ئایا چی وای لەم وڵاتانە کردووە کە هەژار بن، کە دواکەوتوو بن؟!**

یەکەم: ئایا مێژووی شارستانیەتی کۆنیان نیە، مێژوویەکی دوور و درێژیان نیە؟! بەڵێ هەیانە، وڵاتێکی وەکو میصر، مێژووی شارستانیەتی دوو هەزارساڵی ڕابردووی هەیە، کەچی لە ڕیزی وڵاتە دواکەوتووەکان حساب دەکرێت، هەموو بەرهەمەکەی بۆ جیهان: گۆرانی بێژ و مومەسیلە، ئیتر هیچی دیکەی نیە، بەڵام وڵاتێکی وەکو کەنەدا و ئوسترالیا، دوو سەد ساڵە دروست بوون، دوو سەد ساڵ تەمەنیانە، مێژووی شارستانیەتی ڕابردوویان نیە، کەچی لە ڕیزی وڵاتە پێشکەوتووەکانی جیهاندا حسابیان بۆ دەکرێت.

دووەم: ئەگەر سەیری سەرچاوەی سروشتی بکەیت بڵێیت: خاکەکەم بە پیت نیە، ئەمەش ڕاست نیە، چونکە وڵاتێکی وەکو یابان کە ئەمڕۆ مونافیسی گەورەی ئەمریکایە، بەڵکو پێشکەوتوترە لە بواری تەکنەلۆژیادا، لە بواری ماددیەوە هەژارە، لە سەدا هەشتای خاکی یابان نە کشتوکاڵی لێدەکرێت، نە بە کەڵکی مەڕو ماڵاتیش دێت، نە نەوتیشی لە ژێر خاکدا هەیە، بگرە بە قوەتی ئەو

بەشەرانەی کە لەسەری دەژین ئەو هەموو تسونامی و بومە لەرزەی لەو یابانەی دا، لە هەر ولأتێکی تری دابایە، جارێکی کە وەك خۆی لێنەدەهاتەوە، کەچی ئەو بەشەرەی لەسەری دەژیا ئەوەندە خاوەن عەزم و ئیرادە و کارکەرە، هێشتا بە چۆکیدا نادات، هێشتا دەیەوێت جارێکی دیکە هەستێتەوە.. ولأتێکی وەکو ئوسترالیا، تەنها چوار مانگ کشتوکاڵی تێدا دەکرێت، کەچی ئەوەندە بواری ئاژەڵداری برەو پێداوە، نیوەی ئەم جیهانە ماست و پەنیر و شیری ئوسترالیا دەخوات.

سێیەم: لە بواری سەرکردایەتیدا ئەو ولأتانەی دوا کەوتوون، سیاسەتمەدارەکانیان گەلێك زیرەکترن لەو ولأتانەی پێشکەوتوون، ئەو ولأتانەی ئێمە سەرکردەکانیان سیاسەت مەدارتر و زمان زانتر و زیرەکترن، چونکە لەناو گەلێکی ستەم دیدەو بەش خوراودایە.

چوارەمیان: لە ڕووی هێزی بەشەریەوە، هەر ئەم بەشەری لەم کوردستانەدا ئەم گەنجەی کە ئێمە ڕۆژ تا ئێوارە بە بێ کاری دەسوڕێتەوە، دەچێتە ئەو ئەورووپایە هەموو دەست ڕەنگینیەکی لێدەوەشێتەوە، هەموو کارێك دەکات، هیچ نامێنێت نەیکات، بە گیرفانی پڕەوە دەگەڕێتەوە، کەچی هی ئێرەش بەردەوام گیرفانی خاڵیە.

کەواتە پوختەی قسەکانمان ئەوەیە: شەخسیەتی ئینسانەکان وادەکات ئەم ئینسانە دەوڵەمەند بێت، وە ئەم ولأتە پێشکەوتوو بێت، یان لە ڕیزی دواکەوتوو بێت، شەخسیەتی ئینسانەکانە لە ئەورووپا و ئەمریکای ئەمڕۆدا وای کردووە کە پێشکەوون، چونکە لای ئەوان ئیش یەعنی ئەخلاق، هەر شەرت نیە پارە پەیدا

بکەیت، ئەبیَ ئەخلاقی کاریشت هەبێت، ئەبیَ ئەمانەت پارێز بیت، کەچی ئەمە لە ئیسلامیشدا هەیە (مَنْ غَشَّ فَلَيْسَ مِنا) ئەبیَ ئەو کارەی کە دروستی دەکەیت بە ئەمانەتەوە جێبەجێی بکەیت، مەسئولیەتی کارت هەبێت.

## ئیشەکەتت خۆش بوێت

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت (إنَ اللهَ يُحِبُ إذا عَمِلَ أحَدُكُمْ عَمَلاً أنْ يُتْقِنَهُ) خوای گەورە بەندەیەکی پیَ خۆشە کە بە دڵسۆزیو، لێپرسراوێتیەوە کاردەکات، کارەکەی ڕێك و پێکە، ڕێزی ئەوانی تر دەگرێت، لە بەرامبەردا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: ئیمانی هیچ کەس لە ئێوە تەواو نابێت، تا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە، بۆ براکەشی پێی خۆش نەبێت، ئەو ئامێرەی، ئەو کارەی دەیکەیت، وابزانی بۆ خۆتی دەکەیت، ئەو وا لەویَ کاردەکات، بە خۆشەویستی کارکردن کاربکات، نەك وابزانێت بە زۆری دەیکات.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: (إنَّ اللهَ يُحِبُ المؤمنُ المُحْتَرف)، خوا خاوەن پیشەیەکی ڕاستگۆی خۆش دەوێت، کە پیشەکەی خۆتت خۆش بوێت، وانەزانیت بێگاریت پێدەکەن، هەر پیشەیەکت هەیە، ڕەچاوکردنی کار، دڵسۆزی لە کاردا، لە هەمووان گرنگتر کەسی شیاو لە شوێنی گونجاو و شیاودا، ئەمە نهێنی پێشکەوتنە، نهێنی کەسایەتی مرۆڤە، هەر وڵاتێك دەبینیت پێشکەوتووە، بزانە کەسی شیاو لە شوێنی شیاودا دانراوە.

## تا شایان نەبیت کارت پێ ناسپێرێت

(شارلس کوخ) کە خاوەنی پیشەسازیە نەوتەکانی کوخە، لە کتێبی (زانستەکانی سەرکەوتندا) دەڵێت: (گەورەترین بنەمای سەرکەوتنی دەوڵەتانی ڕۆژئاوا و شکستی ڕۆژهەڵاتیەکان ئەوەیە: لە ڕۆژئاوادا هەر کەسێك شایەنی کارێك نەبێت پێی ناسپێردرێت).

لە وڵاتێکی وەکو یاباندا کە ئەورووپیش نیە، تەماشا بکە: کۆمپانیای سۆنی هەیە، کەم ماڵ هەیە ئامێرێکی ئەو کۆمپانیایەی نەبێ کۆمپانیای سۆنی یەکێکە لەو کۆمپانیایانەی کە بەرهەمەکانی خاوەن متمانەن لە بازاڕەکانی جیهاندا، لێی دەحەسێیەوە.. خاوەنی ئەو کۆمپانیایە لە یابان کوڕەکەی بوو بە ئەندازیار، بەڵام باوکی لە ڕیزی ئەو ئەندازیارانە داینا کە ئەو ساڵە خوێندنیان تەواو کردبوو، لەگەڵ برادەرەکانی خۆیدا کە کوڕی فەقیر و هەژار بوون، واتە: کارێکی سادە و ساکار بە موچەیەکی کەمەوە دایمەزراند!

ئەوانەی لەگەڵیدا بوون، ژمێریارەکانی، وتیان: قوربان ئەوە کوڕی جەنابتە، ئێمە وامان زانی لە شوێنی خۆت دەیکەیت بە سەرۆکی کۆمپانیاکە، وتی: نەء پێویستە پلە بە پلە سەربکەوێت، شەرت نیە کوڕی منەو خاوەنی کۆمپانیاکەم، کەسایەتیەکی بۆ دروست نەبووە، نرخی پارە نازانێت، هەرزەکارە، هێشتاش لە ڕووی کارەوە سەرەو دەرێك دەرناکات، با ئەندازیار و خاوەن بڕوانامە بێت، دەبێ قۆناغەکان ببڕێت.. چۆن کوڕەکەم لە شوێنی کابرایەك دانێم کە چل ساڵە لەم کۆمپانیایەدا کار دەکات؟! نەخێر، دەبێت قۆناغ بەندی ببڕێت، ئەوان بۆ کوڕی خۆشیان وان، بۆیە ئەو کۆمپانیایە سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت.

ئێستا ئێمە گەر وڵاتی خۆمان بەنمونە بهێنینەوە، ئەوە لە کوردستاندا گرفتی ماددیمان نیە، پارەمان لە هەموو شتێك زۆرترە، نەوتمان لە هەموو دونیا زۆرترە! بەڵام گرفتی ئەوەمان هەیە بە عەشقەوە کار ناکەین، لە هەمووان خراپتر کەسی شیاومان بۆ شوێنی گونجاو نیە، هەندێ کەس بەبێ ڕەچاو کردنی پلە بەندیو خزمەت دەکرێ بەبەڕێوەبەری فەرمانگەیەك، کەسی واش هەیە ٣٠بۆ٤٠ ساڵ ئەزمونی هەیە دەردەکرێت!

کەسێك دەبینیت هیچ شەخسیەتی نیە لەناو کۆمەڵدا، خەڵك گاڵتەی پێدەکات، کەچی دەکرێت بە بەرپرسێکی گەورە! کەسێکیش خاوەن حورمەت و ڕێزە لەناو خەڵکدا، لە هەر فەرمانگەیەکدا بێت خەڵك متمانەی پێیەتی، پلەکەی زۆر لەخوارەوەیە، لەبەر ئەوە دەبێ لەسەر ئاستی تاکدا چاکسازی بکەین.

ئەمڕۆ زۆرێك لە ئێمە موچەیەکی کەمی هەیە، زۆرمان بەداخەوە لە لادێ دابڕاوین، هەموو ئەو بەرهەمانەی لەلادێ بەرهەم دەهێنرێت وەك کشتوکاڵو مەڕو ماڵاتو.. هیچیمان نیە، لەبچوکترین بەرهەمی ئاژەڵ کە دۆو ماستە تاکو بچوکترین بەرهەمی کشتوکاڵ لەدەرەوە هاوردە دەکرێتو هەمووی هی وڵاتانە، هەمووی چاوەڕێی موچەیەکی مانگانەین، کە ئەوە دەردێکی کوشندەیە، هەتا ئەگەر زۆریش بێت ترسناکە، چونکە ساردمان دەکاتەوە لە کاری ترو پشت بەخۆمان نابەستین.



## بنەماكانی بەعیززەتەوە ژیان:

پێویستە ڕەچاوی كۆمەڵێك بنەما بكەین، بۆ ئەوەی بەم موچە كەمەوە بە عیزەتەوە بژین، بۆ ئەوەی شەخسیەتمان نەشكێت لەناو خەڵكدا:

### خاڵی یەكەم: مانگانە پارەیەكی كەم ببەخشە:

ئەو پارەی وەریدەگریت لە نێوان خۆت و خوادا شتێكی لێ بكە، ئەویش صەدەقە و بەخشینە، ئەگەر پێنج سەد هەزارت هەیە، پێنج هەزاری مانگانە لێ جیاكەرەوە، بەو پێنج هەزارە كاریگەری لە ماددە و دارایت ناكات، وە ئەگەر نەشی دەیت پێی دەوڵەمەند نابیت، لانی كەم لە سەدا دوو یان سێی لێ لابە بۆ هەژارێك، بۆ نەدارێك، بۆ قەرزارێك، بۆ داماوێك.. ئەگەر چوار پێنج برادەر مانگانە كۆببنەوەو پارەكانیان بخەنە سندوقێكەوە، هەر زۆر باشتر دەتوانن دەستگیرۆی هەژارێك یان نەخۆشێك بكەن كە دەرامەتی كەمە، ئەو كاتەی كە ئەمەت كرد، ئەو موچەیەی هەرچەند كەمە، خوا دووشتت بۆ قەرەبوو دەكاتەوە:

یەكەم: دڵنیابە ئەو ماڵە كەم ناكات، كێ وا دەفەرموویت؟! پێغەمبەر ﷺ (**ما نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مال**) پێغەمبەر دەفەرموویت: سوێند دەخۆم خێر و بەخشین لەماڵ و سەروەتتان كەم ناكاتەوە.. بەلاّم ئەو ڕێژە كەمانە زۆر دەكات، زۆر دەكات و كۆمەڵێك گرفت چارە دەكات، دڵ و دەرونیشت ئاسودە دەبێت.

دووەمیان: ئەو كەسانەی موچەیان كەمە، لەیەك مانگدا یەك عەیادەت بۆ ڕێ بكەوێت دەتهێنێتە سەر سفر، وەلاّهی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت (**داوُو مَرضاكُم بالِصَّدَقَة**) زۆر نەخۆشی هەیە بەیەك صەدەقەی بچوك خوای گەورە

دەفعی دەکات لەسەرت، وەلآمی بەیەك صەدەقەی بچوك خوای گەورە شیفای ئەو نەخۆشیەت بۆ دەنێرێت، لەوانەیە چەند وەرەقە سەرف بکەیت، خوای گەورە بە پێنج هەزاری تەبع ئەو بەلآ گەورەیەت لەسەر لاببات. لەبەرئەوە هەوڵبدە هەرچەند موچەت کەمە، فێری بەخشندەیی ببە و مانگانە شتێك ببەخشە.

**خاڵی دووەمیان: خۆت لە قەرز بپارێزە:**

ئەی ئەو کەسانەی کە موچەمان کەمە، خۆت لە قەرز بپارێزە، پێغەمبەری دڵسۆزمان ﷺ دڵسۆزترینی هەموو مرۆڤەکان، لە خۆمان دڵسۆزتر بۆ خۆمان، بە دێڕێکی کورت ئامۆژگاریمان دەکات دەفەرموێت: (**لا تَخيفوا أَنْفُسَكُمْ بَعْدَ أَمْنِيها**)، دوای ئەوەی خوای گەورە بە ئەمین و ئەمان خەڵقی کردووی چاوبەرەژێری کەس نیت، خوا بە ئازادی دروستی کردووی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خۆت تووشی ترسنۆکیو چاوبەرەژێریو ترسو لەرز مەکە..

صەحابەکان عەرزیان کرد (**وَما ذاكَ يا رَسول اللهِ؟!**) ئەی پێغەمبەری خوا مەبەستەکەت ڕوونتر بکەوە، مەبەستت چیە، دوای ئەوەی ئینسان ئازادە، سەربەرزە، خۆی تووشی ترس و لەرز بکات، تووشی موسیبەت و بەلآ بکات؟! پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (**الدَّيْن**) مەبەستم قەرزە، هەتا قەرزدار نیت سەربەرزی، چونکە قەرزار بوویت، وەك دەڵێن: (قەرزار ئەگەر پیاوێکی بە شەخسیەت بێت چاوشۆڕی ڕۆژە و غەم خۆری شەوان).

هەتا دەیدەیتەوە، خوا بە ئازادی خەڵقی کردووی، بەهۆی قەرزاریەوە خۆت سەرشۆڕ مەکە بۆ خەڵك، ملکەچ مەبە، کۆڵان مەگۆڕە لە ترسی خاوەن قەرز، خۆت تووشی قەرز مەکە بۆ قیامەتت..

کابرایەك بە قەرزاری مرد پێغەمبەر ﷺ، فەرمووی: (إِنَّ صاحِبَكُمْ مَحْبُسٌ عَنِ الجَنَّةِ بِدَينِهِ) فەرمووی: هاوەڵەكەتان قەرزارە هەتا قەرزەكانی بۆ نەدرێتەوە دەرگای بەهەشتی لەسەر ناكرێتەوە، ڕێگری دەكرێ لە چونە بەهەشت، وتیان چ پیاوێكی نوێژكەر و ڕۆژووگر و ئەهلی مزگەوت بوو.. بەڵام تا قەرزار بێت سودی نیە.

لەفەرمودەیەكی تردا هاتوە: هاوەڵێك بەناوی سەلەمەی كوڕی ئەكوەع، هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، چوو بە دویدا بۆماڵەوە، فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا جەنازەیەك لە مزگەوتە (صَلِّ عَلَيْها) وەرە نوێژی لەسەر بكە و دوعای خێری بۆ بكە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (هَلْ تَرَكَ شَيْئاً) هیچ ماڵ و سامانی بەجێهێشتووە؟!

جا پێغەمبەر ﷺ زۆر خەمی بوو، ئەگەر ماڵ و سامانی بەجێهێشتووە با سەیر بكەین، ئەگەر وەسیەتی كردووە بۆی جێبەجێ بكەن، ئەگەر قەرزاری قەرزی بۆ بدەنەوە، ئەگەر میرات گری هەن با كەسێكیان زوڵم لەوەی تر نەكات، با ئەم پیاوە بەم ماڵە نەچێتە جەهەنەم..

وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، نەبەخوا هیچی بەجێنەهێشتووە لە ماڵی دنیا، فەرمووی (فَهَلْ عَلَيْهِ دَيْنٌ) ئەی هیچ قەرزی لەسەرن؟ خێزانەكەی وتی: (ثَلاثَةُ دَنانير)، ئەی پێغەمبەری خوا سێ دیناری لەسەرە، سێ دیناری ئاڵتون وەكو بڵێی سێ وەرقە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (صَلّوا عَلى صاحِبِكُمْ) ناتوانم نوێژ لەسەر قەرزار بكەم، چونكە مافی خەڵكی لەسەرە، بڕۆن یەكێك لە ئێوە صەحابەكان نوێژی لەسەر بكات!

پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە گرنگی پێدا لەبەرەکەتی نوێژی پێغەمبەر بێ بەش بوو، هەتا صەحابەیەك بەزەیی پێداهاتەوە، ناوی (بەراء) بوو، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا من لە پێناوی ئەو خوای گەورەدا قەرزەکەی بۆ دەدەمەوە، با لە نوێژی تۆ بێ بەش نەبێت، پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر کرد و چەند رۆژێك تێپەڕی‌و پێغەمبەر ﷺ هەموو رۆژێك لە بەڕائی دەپرسی: قەرزەکەت دایەوە؟! دەیوت: ئەی پێغەمبەری خوا بە تەمام شتێکم هەیە، زەخیرەیەکم هەیە بیفرۆشم‌و قەرزی کابرا بدەمەوە..

ڕۆژێکیان فەرمووی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا دامەوە، فەرمووی ئێستا گرانی ڕۆح کێشانی لەسەر لابرا بەهۆی قەرزەکەیەوە!

قەرز نابێ هەروا بە سادەیی وەربگیرێ، پێویستە هەموو کات ئەو دوعایە بکەین کە پێغەمبەرﷺ فێرمان دەکات‌و دەفەرموێت: (خوایە پەنات پێدەگرم لە قەرزاری بمپارێزە). قەرزاری زۆر پەیوەندی بە شەخسیەتەوە هەیە، ئەو کەسەی کە قەرزار بێ و گوێ نەداتێ بە ئینسانێکی بێ شەخسیەت سەیر دەکرێت، ئەگینا ئەو کەسەی خاوەن کەسایەتی بێ، کە قەرزار بوو قەت ئیسراحەت ناکات، تا دەیداتەوە..



## لەبەر قەرزدارەکەی نوێژ جێدێڵێت!

زانای گەورەی ئیسلام، خەتیبی بەغدادی، یەکێك لە زانا بەناوبانگەکانی ئەم ئیسلامەی ئێمە، خاوەنی چەند تەئلیفاتو کتێبە، دەفەرموێت: یەکێك لە مەشایەخین و مامۆستایانی گەورە بۆی گێڕامەوە، فەرمووی: لە مزگەوتێکدا لە شاری بەغداد جومعەم دەکرد، پیاوێك لەبەردەممدا زۆر نوێژی سونەتی کرد، زۆر صلاواتی لێدا، لەبەردەممدا دانیشتبوو، قورئانێکی جوانی لەبەر دەخوێند.. بەڵام کاتێك کە وتار بێژ چووە سەر منبەر دەست بکات بە وتار، کابرا جومعەکەی بەجێهێشتو ڕۆیشتە دەرەوە! کە ڕۆیشتە دەرەوە پێم ناخۆش بوو، شوێنەکەیم دیاریکردو نەمهێشت کەس شوێنەکەی بگرێ.. هەر چاوەڕێم کرد.. تاکو قامەتی نوێژ کرا، ئیمام نوێژی دابەست، ئەم پیاوە نەگەڕایەوە بۆ شوێنەکە، هەر خاڵی بوو، ئەمجا کەسێك هاتە شوێنەکەی.

دواتر لە بازاڕدا بینیمەوە، وتم: فلان کەس ئەو جومعەیە بۆ نەهاتیتەوە شوێنەکەت؟

وتی: بەداخەوە جومعەم نەکرد، وتم: تۆ لە سەعات یانزەوە لە مزگەوت بوویت، خەریکی قورئان و تەسبیحات و نوێژی سونەت بووی، ئەوەیان سونەتە، کەچی فەرزەکەت تەرك کرد؟!

وتی: تو خوا حاڵێکی تایبەتی خۆم هەیە، وتم: باوەڕ بکە بۆ دڵسۆزی پێت دەڵێم و خۆ لە کارت هەڵناقورتێنم، بەڵکو بتوانم یارمەتیت بدەم..

وتی: وەڵاهی من پێنج هەزار درهەم قەرزارم، بە نەبوونی و نەداری و موحتاجی کۆڵێك خێزانم هەیە، بۆ ئاردی ماڵ تووشی قەرزاری بووم، دڵسۆزانە

هاتبووم بۆ عیبادەت، ئەو کاتەی کە خەتیب چووە سەر مینبەرو سەلامی کرد و جوابی سەلامەکەیم دایەوە، ملم لارکردەوە، خاوەنی قەرزەکەمم بینی، دوو مانگ دەبێت وەختی هاتووەو شەرمەزارمو بۆم نادرێتەوە، هیچم لە دەستدا نیە، وەڵاهی کە چاوم پێی کەوت میزم بەخۆدا کرد لە شەرمازاریدا!!

لەبەر ئەوە لەشم لە نوێژ چوو، تا چوومەماڵەوە شەرواڵم شۆردو هاتمەوە، جومعەکەش تەواو بوو، بە داخەوە جومعەکەم فەوتا..

وتم: قەرزەکەت لای کێیە، وتی: لای فلاَن کەسە، بەڵام پیاوێکی زۆر بەڕێزە، هێشتا ملی نەگرتووم، دەفەرمووێت کابرام دەناسی چووم بۆ دوکانەکەی، سەرمایەدارێکی گەورە بوو، گەنم و دەغڵ و دان و ئاردی دەفرۆشت، وتم: دەتوانی کابرایەك وەکو کۆیلەی لێهاتووە و لە پێناوی خوا ئازادی بکەیت، وتی: چۆن تێم بگەیەنە؟!

وتم: حاڵ و مەسەلەیەکی ئاوا، وتی: خەمت نەبێت–إن شاءَ الله– ڕزگاری دەبێت..

دەفەرمووێت: ئەو پیاوە قەرزارە چوو بۆ لای، چوو عوزری بۆ هێنایەوە، وتی تکات لێدەکەم دوو مانگ بەسەر قەرزەکەدا تێپەڕیوە، وەڵاهی حاڵەتی وام لێبەسەر دێت ڕووی باسکردنی نیە لەشەرمەزاریدا بۆ تۆ! ماوەیەکی دیکە قەرزەکەم بۆ درێژبکەرەوە، وتی: تۆ بڕۆ ماڵەوە لە مەسافەیەکدا منیش سەرت لێدەدەم و قسەیەکی لێدەکەین..

دەڵێ: ئەو ڕۆیشت نەمویست لە دوکانەکەدا هیچی پێ بڵێم، چووم سەردانم کردو دیاریەکیشم بۆ برد، کیسەیەك پارەم پێبوو، دەفتەری قەرزەکانیشم پێ

بوو، وتم: فلان كەس ئەمە دەفتەری قەرزەكەیە، وتی: بەڵێ وتم چەند قەرزاریت، وتی پێنج هەزار درهەم، وتم: خۆ ئینكاری لێناكەیتو مافی منت لایە؟!

وتی: بەڵێ ملكەچم، قەرزاری تۆم..

دەڵێت: خەتێكم بەسەردا هێناو، لە ژێریدا نوسیم ئەم پارەیە واصلێ بووەو دراوەتەوە، وتی: ئەوە چی دەكەیت بەخوا هیچم نیە، بەخوا مەگەر لە ماڵەكە بمكەیتە دەرەوە، خانووەكەشم بایی ئەوە نیە، وتم: مەترسە، ئەمە لەبەر ئەولادەكانم، نەوەك دوای من بمرم و كەس ملت بگرێت، قەرزەكەت عەفوو بوو، ئەم كیسەیەش بگرە، وتی: ئەوە چیە؟!

وتم: چونكە بەم ماڵ و سامانەی من تۆ میزت بەخۆداكرد و جومعەیەكت لەدەست چوو، بۆم گەڕاوەتەوە لە پێناوی ئەوەدا گەردنم ئازاد بكە، ئەوە پێنج هەزار بەخشیشیش بۆخۆت! هەردووكیان یەك لە یەك مەردتر بوون.

## چی بكرێ لەگەڵ قەرز كوێردا؟

ئەگەركەسێ هەیبوو، گیرفانی پڕ بوو چی بكرێت لەبەرامبەریدا؟ بۆنمونە: هەیە بە قەرزی خەڵك خانووی قاتی دووەم دەكات! ئەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت بێ شەخسیەتەو بیشكێنە: (**لَيُّ الواجِدِ يَحِلُّ عِرْضَهُ وَ عُقوبَتَهُ**) قەرز كوێری دەوڵەمەندی، هەبوو، پارەكە لە گیرفانیدایەتی، هەیەتی، قەرزاریشە، قەرزارە بەلاّم هەر قەرز كوێرە، بەهیچ و خۆڕای خۆی لێ پشت گوێ دەخاتو دەستی تۆی بڕیوە و نایداتەوە.. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دوو شتت بۆ هەیە بیكەیت:

یەکەم: لە هەموو مەجلیسێکدا زەمی بکەیت، بە غەیبەت حیساب نیە، با دەستی خەڵکیش نەبڕێت.

دووەمیشیان: بۆت هەیە لە دادگادا شکاتی لێ بکەیتو بە گرتی بدەیت و بیخەیتە زیندانەوە، هەتا قەرزەکەی لێدەستێنن، ئەمەشیان عەیبە بۆ تۆ نیە، ئەو عەیبدارە، چونکە بۆتە هۆی مایەی متمانە لەدەستدانی خەڵك، تۆ دەست گیرۆیت کردووە، پیاوەتیت کردووە، بەلاَم وا دەستت دەسوتێنێت، ئەمجا موحتاجیش بێ بۆ پارە ناوێریت قەرز بدەیت بە خەڵك، ئەمڕۆ قەرز دەستناکەوێت، جاران خەڵکی ولاَتی ئێمە گەلێك بەخشندە بوو، کەس پێویستی بە بانق و ئەمانە نەبوو، دەوڵەمەندەکە پارەکەی دەدایە دەیوت تا پارەیەکت دەست دەکەوێت، تا لە موچەکەت شتێك پاشەکەوت دەکەیت. هەروەك دەڵێن: (دۆستمی تا قەرزارم نیت، قەرزارم بووی دەبیت بە دوژمنم)! دەبێ بە دوژمنایەتی لێی بسێنیتەوە، یان نێوانیان تێك بچێت.

## بەڵای قیستو شەخسیەت

بەداخەوە یەکێك لەو گرفتانەی کە ئەمڕۆ زۆربەی خەڵکی گرتۆتەوە (قیست)ە، کە خەڵك شتێکی زۆر دەکڕێ بۆ کاتێکی زۆر کەهەندێکی پێویستی بەم شێوازە قەرزەش نیە، چونکە دەکرێ بەپارەیەکی کەمتر کاڵو شتی هەرزانتر بکڕرێت بەبێ قەرزار بوون، بۆیە ئەگەر کەسایەتی بەرز بێت ناچێ بەپارەی خەڵکی کەلو پەلی ناپێویست بکڕێ، یان خانوو بکاتو لەکاتی قەرزەکەش چەند ساڵێك تێپەڕیبێت.. بۆیە کەسی ڕێزدارو بەشەخسیەت، هەمیشە بەقەناعەتەو هەمیشە

بەرەچاوکردنی گیرفانی خۆی کەلو پەل دەکڕێ نەک بەچاولێکەری دەوڵەمەندانو گیرفانیشت بەتاڵ بێت یان بەپشت بەستن بە موچەیەکی کەم..

بۆیە گیرفان بەتاڵی سەربەرز زۆر باشترە لەپارە دارێکی سەرشۆڕ.. چونکە هەندێ کەس لەبەر قەرزاری شوێنی دانیشتنیانو ژمارەی تەلەفۆنیان دەگۆڕن یان تێکەڵی خەڵک نابن.. کەئەمانەش بێگومان کەسایەتی دادەبەزێنن، بۆیە دەڵێین: ئەی کەسی ڕێزدار لەسەر حەسیر دابنیشە هی خۆت بێت، نەک فەرشی ئێرانیو تورکی بەڵام هی خەڵک بێت..

### قیستی سەیارە

یەکێك لەوجۆرە قەرزانە قیستی سەیارەیە، سەیارەش ئامێرێکە لە خزمەتی مرۆڤدایە، ئەگەر خوا بیدات زۆر شتێکی باشە، قیست لە شەرعدا دروستە، بەمەرجو شەرتی خۆی بۆیە کاتێك قیست وەردەگیرێتەوەو شتێك لەپارەکەی زیاد دەکات، ئەم پارە نیە لەبری پارەیە لەبری کەلو پەل بۆیە نابێتە ڕیبا..

واباشە بپرسین قیست بۆ کێ باشترە؟ بۆ ئەو کەسانەی کەزۆر پێویستیان بەو ئامێرە هەیە، یان بەبێ ئەو سەیارەیە ژیانیان ناگوزەرێ یان ئیشی پێ دەکەن بۆیان گونجاوە نەك بچێ سەیارەیەکی زۆر گران بکڕێت کە زۆر زیاتر بێت لە توانای خۆی.. وەرە بەقەدەر پارەکەی خۆت سەیارەیەکی بەکارهاتوو بکڕە، با خەڵك پێت بڵێن داشقەیە، بەڵام زۆر بە مورتاحیەوە لێی بخورە، نەك سەد وەرەقە قەرزار بی و هیچیشت لە جێگادا نەبێت، هەر ڕاکێشانی سەیارەکە مەرج نیە، دەبێت ئەودیویشی ببینیت، وابزانە تۆ لەو هەزاران خەڵکەی تووشی حادیسە دەبن، ڕۆژانە تۆش موعەرەزی توش ببیت.

کەواتە قیستی سەیارە بۆ کەسی دەوڵەمەند کە شتی زۆر لە جێگادا هەیە لە شمەکەك زیاتر دروستە، بەڵام بۆ هەژار، شەخسیەت دابەزاندنە و موحتاجی دەستی خزم و کەس و کار و پارە کۆکردنەوە دەبیت، خۆ بەهیلاك دانە و بۆ تۆ حەرامە، کەواتە قیست بە پێی کەسەکان و فتوای شەرعی بە پێی زەمەنەکان و کەسەکان دەگۆڕێت.

## ئەی ئافرەتان هاوکار بن و قەرز مەکەن

ئەبێ خوشکانیش هاوکاری برایان بن، ئەمە زیاتر دەکەوێتە سەر ئافرەتانیش، جاری واهەیە پیاوەکە قەناعەتی هەیە، بەڵام ژنەکە قەناعەت ناکات، ژنی واهەیە دەچێتە ئەو بازاڕە چاوی هەرچی بینیو پێی جوان بوو، یان ڕیکلامی بۆکرابوو دەیهێنێت. تۆ وەرە پارەکە کۆکەرەوە هەتا تۆ پارەکە پێکەوە دەنێیت، بە ئیزنی ئەو خوایە ئەویش نیواو نیو دەشکێت، چونکە هەر شتێك یەکەمجار بکەوێتە بازاڕەوە هەتا خەڵك لێی تێر دەبێت، نیواو نیو دەشکێت، تۆ هەمان کەلو پەلیشت دەست دەکەوێت.. مادام موچەت کەمە، ئاساییە با یەکەمجار نەیەتە ماڵی تۆ، وەکو دەوڵەمەندەکە، پارەکەت بە شێنەی کۆبکەوە، دەستی مێردەکەت بگرە، ژیانی هاوسەریتان بپارێزن.

چەند ئافرەت تەڵاق دراوە هەرچی گرفت بێت نەیان بووە، لەسەر ئەم قیست و قیستکاریە نەبێت، بێ ئاگاداری کابرای مێردی کەلو پەلی بەقیست وەرگرتوە، پێش ئەوەی بەکاری بهێنێ مۆدێلی بەسەر چوەو داوای گۆڕینیش دەکات، ئەمانە هەمووی کاریگەری سەلبی دەکەنە سەر شەخسیەتی کەسەکان..

## ڕیكلامی خراپ:

ئەو ڕیكلامانە هەموو ڕیكیەكێكی دیكە لە هاندەری مرۆڤ بۆ دەست بڵاوی یان قەرز كردن، بۆ شت كڕین ڕیكلامی ناڕاستو لەواقع بەدەرە، ئیتر بۆ خواردن بێت یان پۆشاك یان هێڵی تەلەفۆنو ئینتەرنێت.. كاریگەری خراپ دەكەن لەسەر خەڵكی بۆ كڕینیانو بەكارهێنانیان، بۆیە تاپارەی حازرت نەبێ مەیكڕە بەڕیكلامی درۆش تێمەكەوە..

## ئاڵتون بەقەرز:

ئێستا خەڵك فێربووە دەچێت ئاڵتون بەقەرز دێنێت، برای بەڕێزم ئاڵتون بە قەرز، ئەوانەی زەڕەنگەرن، ئەوانەی كڕیارن بزانن ڕیبایە. ڕیباش گوناحەكەی لەوە زیاترە لەگەڵ دایكی خۆتدا زینا بكەیت، سی جار لەوە زیاترە، بۆ؟ چونكە شەخسیەتت ورد دەبێت، ئەو كەسەی زینا لەگەڵ دایكی خۆی دەكات هەموو تفـو نەعلەتی دەكەن، ئەو كەسەش كە هەموو ڕۆژێك یەخەیان پێ گرتوویت تووشی شەڕ و شۆڕ و شوڕتە و ئاسایش و زیندان بوویت، وەكو ئەو شەخسیەتت دەشكێت، بۆیە لەم زەمانەدا ئاڵتون بەماڵ دانانرێت چونكە دوای كڕینی، بەهای یەكەمجاری لەدەس دەدات، بۆیە واباشە بەپارەی حازر بكررێت بۆئەوەی توشی ڕیبا نەبیت..

## دینار بە دۆلار:

كەسێك دۆلار دەكرێت لە نوسینگەیەكی دۆلار فرۆشتن، دەڵێت: من ئەوەندەم دەوێت دۆلار بە سەد و بیست هەزار، دۆلارە دوای پارەكەت بە تەبع دەدەمێ،

ئەمەش حەرامە. پارە بە پارە گۆڕینەوەی دەبێت جیاواز بن، ئەگەر زیادەی بچێتە سەر واتە دینار بە دۆلار هەرچەند جیاواز بن، ئەو سەدە، ئەو سەد و بیستە دروستە، بەڵام دەبێت دەست بە دەست بێت، هەر ڕێك لەوێ ئەو دۆلارەکەی دایە، ئەم دینارەکەی حازر بێت، بۆ بۆئەوەی تووشی گرفت نەبێت دوایی دۆلارت دا بە قەرز لەگەڵی ببڕێنەوە، بڵێ من دۆلارت دەدەمەوە، نەك بڵێت وەڵا دۆلار بەرز بوو نزم بوو، ئێستا چەند برا هەیە خەڵك ئاوا نێوانیان تێکچوە.

کەس هەیە کێشەیان لەسەر ئەوەیە دەڵێت: بە سەد و پەنجا هەزار بووە، ئێستا بە سەد و بیستە نامەوێتەوە، نەخێر لەگەڵی ببڕێنەوە، ئەوەش کە لە نوسینگەکانە، دۆلار مەدە بە هیچ کەسێك هەتا ڕێك پارەکەی پێنەبێت، بۆ ئەوەی لێت نەبێتە دوژمن و ئەگەر نیەتی دۆلاری بۆ چیە، با دەستت نەبڕێت..

**پارە ڕاکێشان لە بانقەکان:**

دەڵێت: پەنجا وەرەقە ڕادەکێشم بۆ ساڵێك و پێنج وەرەقەی دەچێتە سەر، ناوی ئیسلامیەکەشی ناشرین کردووە، دەڵێت: بانقی ئیسلامی، بانقێك شك نابەم لەم وڵاتەدا ناوی ئیسلامی لەسەر بێت، ئەمە دەزانێت خەڵکەکەمان مسوڵمانە، کە وتی ئیسلامی وا دەزانێت ڕاستە! ئەمە دووجار تاوانبارە، هەم ڕیبا خۆرە، هەم ناوی ئیسلامیش ئیستیغلال دەکات بۆ خۆی، نەوەڵاهی ئەوانە هەموو بانقی ڕیبەوین، وە هەموویان ڕیابازن..

## دەست بلاو مەبن

دەست بلاوی بەکار مەهێنە، زۆر لە خوشکان موچەکەت کەمە، لە چیدا دەست بلاوی لە خواردنو کەلو پەل یان جاری واهەیە لە برادەرگرتنە، کاکە تۆ موچەیەکی کەمت هەیە، پێویستە سێ برادەرت هەبێ، بەلاّم سێ سەد کەس دەناسیت، ئاخر ئەگەر ئەم سێ سەد کەسە هات بۆ مالّت بۆت تێر ناکرێت.. لە یەکێك لە کتێبەکاندا فەیلەسوفێك دەلّێت: (ئەوەندەبرادەر و ناسیا و دۆست بگرە لە کاتی دەولّەمەندیدا، حیسابی ئەوە بکە ئەگەر فەقیر کەوتیت بەیانی هاتنە مالّت بۆت تێر بکرێن).

بەقەدەر موچەکەت دیاری بۆ خەلّك بەرە، (جۆرج فۆن) باسی ئەوە دەکات، قسەیەکی جوانی هەیە ئەو زانایە، دەلّێت: (زۆر بە وریاییەوە دەمی جزدانەکەت و زنجیرەکەی بکەرەوە، پەلەی لێمەکە، زۆر بە وریایش پارەی لێ دەربهێنە، چەندە دەمی جزدانەکەت بچوك بێت، ئەوەندە نهێنی مالّەکەت پارێزراوە، وە گیرفانیشت دایمە پڕترە)..



# پێڕست

## بەشی سێهەم

## کەسایەتی نەفس بەرز و

## بەشی چوارەم

## پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کردەوانە ئاگادارمان دەکاتەوە

## که کەسایەتی مرۆڤ لەکەدار دەکەن................ ٨٣



## بەشی پێنجەم

## هەر کەس کەسایەتی بەهێز نەبێ،

## بە شاهید وەرناگیرێ..................................١١١

## بەشی شەشەم

## بەشی حەوتەم



## بەشی هەشتەم




## لەم کتێبەدا:

- ❖ کەسایەتی نەفس بەرزو خاوەن هەڵوێست کێیە؟
- ❖ بەچی خۆمان بپارێزین لەوشتانەی کەسایەتیمان لەناودەبات؟
- ❖ تەنها پشت بەخوا ببەستە بۆ پاراستنی کەسایەتیت.
- ❖ کەسایەتی مرۆڤی مسوڵمان لەقورئاندا.
- ❖ ئاگادار کردنەوەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆ لەکەدارنەبونی کەسایەتیمان..
- ❖ پێوەرە هەڵەکانی هەڵسەنگاندنی کەسایەتی‌و .. چەندان باسی دیکە

سەبارەت بەکەسایەتی بخوێنەوە..





نرخ ٥٥٠٠

پرۆژەی گەشە

بۆ پەرەپێدان و تێگەیشتن

٠٧٥٠ ١٢١ ٤٧٧٣

٠٧٥٠١٣٦٥٢١٥




گەشە